الاربعين النواوية

روونكردنەوەی

# چل حەدیسەکەی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

# ڕوونکردنەوەی

# چل حەدیسەکەی پێغەمبەر ﷺ

## ناسراو بە

# ( اَلأرْبَعِينَ النَّواوِيَّة )

## للإمام النَّواوِي

دانانی

## عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی

چاپی هەشتەم

ذي‌القعدة ( ١٤٣٣ )ی کۆچی

ڕەزبەر ( ٢٧١٢ )ی کوردی

أيلول ( ٢٠١٢ )ی زایینی

*کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی لە هەولێر، چاپی کردۆتەوە*

**ناوی کتاب:** ڕوونکردنەوەی چل حەدیسەکەی پێغەمبەر ﷺ.
**بابەت:** فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ.
**دانەر:** عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی.
**نۆبەتی چاپ:** هەشتەم.
**بەرواری چاپ:** (١٤٣٣)کوچی-(٢٧١٢)کوردی-(٢٠١٢)زایینی.
**تیراژ:** (٢٠٠٠) دانە.
**بڵاوکەرەوە:** کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی، لە هەولێر.
**چاپخانە:** حاجی هاشم - هەولێر.

---

چاپی **یەکەم:** ٥٠٠٠ دانە لە چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری/ هەولێر -(١٩٩٣).
چاپی **دووەم:** ٢٠٠٠ دانە لە چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر -(١٩٩٦).
چاپی **سێیەم:** ١٠٠٠ دانە لە چاپخانەی زانکۆی صلاح الدین/ هەولێر -(١٩٩٩).
چاپی **چوارەم:** ٢٠٠٠ دانە لە چاپخای وەزارەتی ڕۆشنبیری/ هەولێر -(٢٠٠٢).
چاپی **پێنجەم:** ٢٠٠٠ دانە لە چاپخانەی نەوا/ هەولێر -(٢٠٠٦).
چاپی **شەشەم:** ٢٠٠٠ دانە لە چاپخانەی نەوا/ هەولێر -(٢٠٠٨).
چاپی **حەفتەم:** ٢٠٠٠ دانە لە چاپخانەی ڕۆژهەڵات/ هەولێر -(٢٠١٠).

---

**دانراوەکانی تری دانەر:**

١- ڕوونکردنەوەی (**متن فتح القریب**).
٢- ڕوونکردنەوەی (**العَقیدَة الطَحاویة**).
٣- **عەقیدەی ئیسلامی لە سەر ڕێڕەوی (أهل السنة والجماعة)**.
٤- **مۆنراوەی (ئیمان و ئیسلام)**.
٥- **چەند گوڵێك لە (گوڵزاری ئیسلام)**.
٦- ڕوونکردنەوەی (**منهاج الطالبین**).
٧- ڕوونکردنەوەی (**قطر العارض فی علم الفرائض**).
٨- **چۆنیەتی (حەج و عومرە)**.
٩- ﴿**مێرگ وگوڵزاری بەهار* ژیانی پێغەمبەری پێزدار ﷺ**﴾.

بسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيمِ

اَلْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلَى سَـيِّدنا مُحَمَّـــد وَآلِـــه وَصَـــحْبِه أَجْمَعِـــين.

ئینجا له دوای سوپاسی خوداو درود له سەر پێغەمبەرﷺ، ئەی موسوڵمانی بەڕێز: هەروەك ئاشكرایه دوژمنانی ئیسلام به هەموو جۆرێك ئەیانەوێ لاوەكانمان لـه ئـایینی ئیسلام دوور بخەنەوەو له ڕەوشتی باش بێبەشیان بكەن:

جارێك بـه زوڕنالێـدانی كۆنەپەرستی، جارێـك بـه دەهـۆڵ لێدانی مـاف نەدانی ئـافرەت‌و دانهەهێنان به مافی نەتەوایەتی، بەم جۆره ژەهر ئەكەنـه نـاو هـەنگوین‌و دەرخـواردی لاوی كوردی ئەدەن‌و ئەیكەنه دوژمنی ئیسلام.

بەڵام-سوپاس بۆ خوای گەوره- وا به چاوی خۆمان ئەبینین بەچكه شێرانی سـەلاحەددینی ئەییوبی ئەم ژەهرەیان دۆزیەوەو زانییان سەركەوتن‌و پێشكەوتن‌و ڕزگاریی كوردستـان هـەر به دەست پێوەگرتنی ئایینی ئیسلام ئەبێ، چونكه كوردستانێك: میوانـداری (حـەزرەتی نـوح پێغەمبەریﷺ) كردبێ‌و پێغەمبەرێكی وەك (حەزرەتی ئیبراهیم خەلیلی بتشـكێنیﷺ) گـەوره كردبێ‌و پاڵەوانێكی وەك (سەلاحەددینی ئـەییوبی)ی لێ‌هەڵكـەوتبێ، چۆن دوژمنـانی ئیسـلام ڕێگه ئەدەن ڕزگار ببێ‌و ببێتەوه یەك پارچەو سەربەخۆ بێ؟.

ئینجا له بەر ئەوەی هەستێكی ئایینی زۆر گـەرم لـه نـاو لاوەكـانی كوردسـتاندا بـڵاو بۆتـەوەو زۆربەی مزگەوتەكانی كوردستان قورئانی‌پیرۆزو فـەرموودەكانی پێغەمبـەری خۆشەویستیﷺ تێدا ئەخوێندرێ، وه بۆ ئەوەی منیش لـه كـاروانی ئـەم لاوانـه بەشـدار بم، بڕیـارمدا: ئـەو چـل حەدیسەی ئیمامی (نەواوی) كۆی كردۆتـەوەو ناسـراوه بـه (ئەربەعینـەی نـەواوی)، بـه زمـانی كوردی ڕوونی بكەمەوەو چۆنیەتی ڕوون كردنەوەم بەم شێوەیه بێ:

پێناسەی ئەو شتانەی تـێدا بێ: كـه پێویسـتن، وەك سـەحابەو زانایـانی حـەدیس...هتـد هەروەها: ووشەو ڕستەكان وەربگێڕم‌و مەبەستەكەش دیاری بكـەم؛ وه بڕیـاری شـەریعەتی ئیسلام لەو بابەته چی‌یه؟ بینوسم.

ئینجا ئەی موسوڵمانی بەڕێز: ئەگەر له شتێكدا-كه من نووسیومه- گومانت لێ‌پەیدا بـوو، بـۆ ئەوەی دڵنیابی تەماشای كتێبی (فتح المبين) بكه كه شەرحی (ئەربەعینەی نەواوی‌یه) لەگەڵ حاشیەی (المدابغي) كه لەگەڵی‌دایه، هەروەها تەماشـای (تحفـة المحتـاج) بكـه، كـه شـەرحی (منهاج)ی نەواوی‌یه، لەگەڵ حاشیەی (الشرواني) كـه لەگەڵی‌دایـه، چـونكه بـه زۆری زانسـتی ئەم ڕوون كردنەوەم لەم سەرچاوانه هـەڵێنجاوه، ئـیتر دوعـام بـۆ بكـه خـوا یارمـەتیم بـدا بـۆ خزمەتی ئایینی‌ئیسلام، وه ئەگەر كەم‌و كوڕیەكت بینی، یان هەڵەیـەكت بەرچـاو كـەوت، بـۆم ڕاست بكەوه، خوا پاداشتت بنووسێ، خوا یاریدەدەری هەمووومان بێ، آمین.

عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی

مانگی مەولودی پێغەمبەرﷺ- ساڵی(١٤١٣)ی كۆچی

هەولێر- كوردستان

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

اَلْحَمْدُ لِلّه رَبِّ الْعَالَمِينَ، قَيُّومِ السَّموات وَالأَرَضِين، مُدَبِّرِ الْخَلائِقِ أَجْمَعِين باعث الرُّسُلِ –صلواتُ الله وسلامُهُ عليهم– إِلَى الْمُكَلَّفِينَ لِهِدايَتِهِم، وَبَيانِ شَرائِعِ الدِّينِ بِالدَّلائِلِ الْقَطْعِيَّة، وَواضحات البَراهِين،

## ﴿ پێناسەی ئیمامی (النواوی) ﴾

ئیمامی (النواوي) ناوی (یحیی) کوڕی (شرف)ی نەواویەیە، لە مانگی (محرم)ی ساڵی (٦٣١)ی کۆچی لە گوندی (نەوا) لە (جۆلان)ی سەر بە (دیمشق) لە دایك بووە، هەر لە گوندەکەی خۆی لە سەردەمی منداڵیدا قورئانی پیرۆزی لەبەر کردوە، لە تەمەنی (١٩) ساڵیدا باوکی ناردی بۆ (دیمشق) لەوێش لە لای زۆر کەس خوێندویەتی، یەکێك لە مامۆستایەکانی ناوی (سالار)ی کوردی بوو، یەکێکیتر ناوی (عزالدین)ی هەولێری بوو.

ئیمامی (النواوي) دانراوی زۆری هەنە بە تایبەتی لە (حدیث)و (شرع): وەکو (ریاض الصالحین)و (الأذکار)و (شرح صحیح مسلم)و (منهاج الطالبین)و (الأربعین النواویة)–کە ئێمە ئێستا خزمەتی ئەکەین– جگە لە مانەش.

ئیمامی (النواوي) یەکێکە لە زانا هەرە بەرزەکانی چینی (خَلَف)، لە حەدیسو شەرع دەستێکی باڵای هەبوو، لە سەر ڕاڕەوی ئیمامی (شافعی) بوو، لەگەڵ ئەوەشدا جێگەی باوەڕی زانایانی هەر چوار مەزهەبەکانەو ڕێز لە فەرموودەکانی ئەنێن.

ئیمامی (النواوي) لە (٢٤)ی (رجب)ی ساڵی (٦٧٦)ی کۆچی لە گوندی (نَوا) وەفاتی کردوە، خوا لێی ڕازی بێو ڕەحمەتو بەرەکەتی خوا برژێ بە سەر گۆڕیدا. آمین

## ﴿ پێشەکی ئیمامی (النواوی) ﴾

ئیمامی (النواوی) ئەفەرموێ: (بِسمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم) بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان دەست بە کۆکردنەوەی ئەم چل حەدیسە ئەکەم (الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) سوپاس بۆ ئەو خوایەی پەروەردگاری هەموو دروستکراوێکە (قَيُّومِ السَّموات وَالأرَضِين) ئەو خوایەی ئاگادارو هەڵسوڕێنەری ئاسمانەکانو زەمینەکانە (مُدبِّرِ الْخَلائِقِ أَجْمَعِين) ئەو خودایەی بەجێهێنەرو بەڕێوەبەری کاروباری هەموو دروستکراوێکە بە گشتی (باعِثِ الرُّسُلِ صَلَواتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِمْ) هەموو پێغەمبەرێك ئەو ناردوویەتی صَلَّى اللهُ عَلَيهِمْ أَجْمَعِين (إِلَى الْمُكَلَّفِينَ) بۆ لای ئەوانەی داوای خوا ئەیانگرێتەوە–(ئەوانەی بیروهۆشیان تەواوەو لە قۆناغی منداڵی تێپەڕ بوینە)– (لِهِدايَتِهِمْ) بۆ ئەوەی ڕێگەی ڕاست بۆ ئەو داوا لێکراوانە ڕوون بکەنەوەو شارەزایان بکەن (وَبَيانِ شَرائِعِ الدِّين) هەروەها بۆ ئەوەی یاسایەکانی ئاینی خۆیان بۆ دیاری بکەن، (بِالدَّلائِلِ الْقَطْعِيَّة) بە بەڵگەی وا: گومانی تێدا نەبێ، (وَواضِحاتِ البَراهِين) ئەو بەڵگانەی زۆر ئاشکران.

أَحْمَدُهُ عَلَى جَمِيعِ نِعَمِه، وَأَسْأَلُهُ الْمَزِيدَ مِنْ فَضْلِه وَكَرَمِه، وَأَشْهَدُ أَن لآإِلَهَ إِلآَاللهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ الْكَرِيمُ الْغَفَّارُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَحَبِيبُهُ وَخَلِيلُهُ أَفْضَلُ الْمَخْلُوقِينَ الْمُكَرَّمُ بِالْقُرْآنِ الْعَزِيزِ الْمُعْجِزَةِ الْمُسْتَمِرَّةِ عَلَى تَعَاقُبِ السِّنِينَ وَبِالسُّنَنِ الْمُسْتَنِيرَةِ لِلْمُسْتَرْشِدِينَ الْمَخْصُوصُ بِجَوَامِعِ الكَلِمِ وَسَمَاحَةِ الدِّينِ، صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلاَمُهُ عَلَيْهِ وَعَلَى سَائِرِ النَّبِيِّينَ وَالْمُرْسَلِينَ وَآلِ كُلٍّ وَسَائِرِ الصَّالِحِينَ.

أَمَّا بَعْدُ: فَقَدْ رَوَيْنَا عَنْ عَلِيِّ بنِ أَبِي‌طَالِبٍ وَعَبْدِاللهِ بنِ مَسْعُودٍ، وَمُعَاذِ بنِ جَبَلٍ، وَأَبِي‌الدَّرْدَاءِ، وَابْنِ عُمَرَ، وَابنِ عَبَّاسٍ، وَأَنَسِ بنِ مَالِكٍ، وَأَبِي‌هُرَيْرَةَ، وَأَبِي‌سَعِيدٍ الْخُدْرِي– رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمْ– مِنْ طُرُقٍ كَثِيرَاتٍ بِرِوَايَاتٍ مُتَنَوِّعَاتٍ:

---

(أَحْمَدُهُ) سوپاسی خوا ئەکەم (عَلَى جَمِيعِ نِعَمِه) لە سەر هەموو ئەو چاکانەی لەگەڵ ئێمەی کردوە (وَأَسْأَلُهُ الْمَزِيدَ مِنْ فَضْلِه وَكَرَمِه) داوا لە خوا ئەکەم کە لە بەر گەورەیی خۆیو بەخشینی خۆی زیاترمان بداتێ (وَأَشْهَدُ أَن لاإِلَهَ إِلاَّاللهُ) بە دڵو بە زوبان ئەڵێمو گومانم نیێە، جگە لە زاتی (الله) هیچ خوایەك نییە (الواحدُ) یەك خودایە (القهّارُ) دەستەڵاتی تەواوی هەیە (الْكَرِيمُ) چاکەی نابڕێتەوە (الغَفَّارُ) تاوانی بەندەکانی خۆی دائەپۆشێ (وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) هەروەها: بە دڵو بە زوبان ئەڵێم گومانم نییە کەوا محمد ﷺ بەندەو پێغەمبەری خوایە (وَحَبِيبُهُ وَخَلِيلُهُ) خۆشەویستو دۆستی خوایە (أَفْضَلُ الْمَخْلُوقِينَ) لە هەموو خەڵکی گەورەترە (الْمُكَرَّمُ) لە لای خوا ڕێزی لێندراوە (بِالْقُرْآنِ الْعَزِيزِ) کە لە لای خوا قورئانی ئازیزی پێدراوە (الْمُعْجِزَةِ الْمُسْتَمِرَّةِ) ئەو قورئانە پیرۆزە بەڵگەی بەردەوامی پێغەمبەرە ﷺ کەس ناتوانێ قورئانێکی وا ڕێك بخا (عَلَى تَعَاقُبِ السِّنِينَ) ئەم قورئانە پیرۆزەی ساڵەهای ساڵ هەر دەمێنێ (وَبِالسُّنَنِ الْمُسْتَنِيرَةِ) هەروەها لە لای خوا ڕێزی لێندراوە بە فەرموودەو کردەوە ڕۆشنەکانی (لِلْمُسْتَرْشِدِينَ) بۆ ئەوانەی ئەیانەوێ سوود لە فەرموودەکانی وەربگرن (الْمَخْصُوصِ بِجَوَامِعِ الكَلِمِ) تاکە پێغەمبەرێکە کە فەرموودەی کورتو پڕ مانای پێبەخشراوە (وَسَمَاحَةِ الدِّينِ) ئایینێکی ئاسانی پێبەخشراوە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلاَمُهُ عَلَيْهِ وَعَلَى سَائِرِ النَّبِيِّينَ وَالْمُرْسَلِينَ) درودو سڵاوی خوای گەورە بڕژێ بە سەر ئەو پێغەمبەرەو هەموو پێغەمبەرانی تر (وَآلِ كُلٍّ) بۆ سەر ماڵو خێزانی هەموانیان (وَسَائِرِ الصَّالِحِينَ) بۆ سەر هەموو پیاوچاکان.

(أَمَّا بَعْدُ) لە پاش سوپاسو درودی خوا بۆ سەر پێغەمبەران، بزانە: ئەوەی بۆت ئەڵێم (فَقَدْ رَوَيْنَا عَنْ) فەرموودەیەکی پێغەمبەرمان ﷺ پێگەیشتوە: لە (عَلِيِّ بنِ أَبِي طَالِبٍ، وَعَبْدِاللهِ بنِ مَسْعُودٍ، وَمُعَاذِ بنِ جَبَلٍ، وَأَبِي‌الدَّرْدَاءِ، وَابنِ عُمَرَ، وَابنِ عَبَّاسٍ، وَأَنَسِ بنِ مَالِكٍ، وَأَبِي‌هُرَيْرَةَ، وَأَبِي‌سَعِيدٍالْخُدْرِي) لەو سەحابە بەڕێزانە (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) خوا لێیان ڕازی بێ (مِنْ طُرُقٍ كَثِيرَاتٍ) لە چەند ڕێگای زۆر (بِرِوَايَاتٍ مُتَنَوِّعَاتٍ) بە گێڕانەوەی جۆراوجۆر، ئەم

أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قالَ: (مَنْ حفظَ عَلَى أُمَّتِي أَرْبَعينَ حَديثاً مِنْ أَمْرِ دينِها بَعَثَهُ اللّهُ تَعالَى يَوْمَ الْقيامَة في زُمْرَةِ الْفُقَهاءِ وَالْعُلَماءِ). وَفي رِوايَة: (بَعَثَهُ اللّهُ تَعالَى فَقيهاً عالماً). وَفي رِوايَة أَبي الدَّرْداءِ رضي الله عنه: (كُنْتُ لَهُ يَوْمَ الْقيامَة شافِعاً وَشَهيداً). وَفي رِوايَة ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: (قيلَ لَهُ ادْخُلْ مِنْ أَيِّ أَبْوابِ الْجَنَّة شِئْتَ). وَفي رِوايَة ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: (كُتِبَ في زُمْرَةِ الْعُلَماءِ وَحُشِرَ في زُمْرَةِ الشُّهَداءِ).

وَاتَّفَقَ الْحُفَّاظُ عَلَى أَنَّهُ حَديثٌ ضَعيفٌ وَإِنْ كَثُرَتْ طُرُقُه. وَقَدْ صَنَّفَ الْعُلَماءُ في هَذَا الْبابِ ما لاَ يُحْصَى مِنَ الْمُصَنَّفات، فَأَوَّلُ مَنْ عَلمتُهُ صَنَّفَ فيه: عَبْدُاللهِ بن الْمُبارَك، ثُمَّ مُحَمَّد بن أسلم الطُّوسي الْعالِم الرَّبَّاني، ثُمَّ الْحَسَن بن سُفْيان النَّسَوي، وَأَبوبَكْرٍ الآجُري، وَأَبوبَكْرٍ مُحَمَّد بن إبْراهيم الأَصْفَهانيّ، وَالدَّارَقُطْني، وَالْحاكِم، وَأَبونَعيم، وَأَبوعَبْدالرَّحْمَن السُّلَميُّ،

---

فەرموودەمان پێگەیشتوە: (أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿مَنْ حفظَ عَلَى أُمَّتِي أَرْبَعينَ حَديثاً مِنْ أَمْرِ دينِها بَعَثَهُ اللّهُ تَعالَى يَوْمَ الْقيامَة في زُمْرَةِ الْفُقَهاءِ وَالْعُلَماءِ﴾ هەر کەسێك بیگەیەنێتە ئوممەتی من چل حەدیسی من لە کاروباری ئایینی ئیسلام، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت زیندووی ئەکاتەوە لەگەڵ کۆمەڵی زانایانی ئایینی.

(وَ) بە چەند شێوەیەکی تریش ئەم فەرموودەیە هاتوە: **یەکەم:** (في رِوايَة: بَعَثَهُ اللّهُ تَعالَى فَقيهاً عالماً) لە گێڕانەوەیەکدا: (خوای گەورە زیندووی ئەکاتەوەو پلەی زانایەکی تەواوی ئەداتێ).

**دووەم:** (وَفي رِوايَة أَبي الدَّرْداءِ رضي الله عنه: كُنْتُ لَهُ يَوْمَ الْقيامَة شافِعاً وَشَهيداً) لە ڕێگەی (أبي الدرداء رضي الله عنه) ئەفەرموێ: (خۆم تکای بۆ ئەکەم لە لای خوای گەورە تا لێی ببورێو بیباتە بەهەشت). **سێیەم:** (وَفي رِوايَة ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: قيلَ لَهُ ادْخُلْ مِنْ أَيِّ أَبْوابِ الْجَنَّة شِئْتَ) لە ڕێگەی ئیبن مسعود ئەفەرموێ: (لە ڕۆژی دوایی پێی ئەڵێن: بچۆ بۆ بەهەشت لەکام دەرگاوە ئەتەوێ). **چوارەم:** (وَفي رِوايَة ابنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: كُتِبَ في زُمْرَةِ الْعُلَماءِ وَحُشِرَ في زُمْرَةِ الشُّهَداءِ) لە ڕێگەی ئیبن عمر ئەفەرموێ: (لەگەڵ کۆمەڵی زانایانی ئایینی ئەنووسرێو لەگەڵ کۆمەڵی شەهیدان حەشر ئەکرێ).

(وَاتَّفَقَ الْحُفَّاظُ) زانایانی حەدیس یەکدەنگن (عَلَى أَنَّهُ حَديثٌ ضَعيفٌ، وَإِنْ كَثُرَتْ طُرُقُه) لە سەر ئەوەی ئەم حەدیسە بێهێزە هەرچەندە ڕێگەشی زۆر بن.

(وَقَدْ صَنَّفَ الْعُلَماءُ في هَذَا الْبابِ مالاَ يُحْصَى مِنَ الْمُصَنَّفات) زانایانی حەدیس لەم بابەتە زۆریان نووسیوەو نایەنە ژمار (فَأَوَّلُ مَنْ عَلمتُهُ صَنَّفَ فيه: عَبْدُاللهِ بن الْمُبارَك) یەکەم زانا: کە لەم بابەتە چل حەدیسی کۆ کردبێتەوە—وەکو زانیومە— ئیمام (عبدالله) کوڕی (موبارەك) بووە (ثُمَّ) لە دوای ئەویش چەند زانایەکی تر: وەکو ئیمام (مُحَمَّدُ بن أسلم الطُّوسي العالِمُ الرَّبَّاني، ثُمَّ الْحَسَنُ بن سُفْيانَ النَّسَوي، وَأَبُوبَكْرٍ الآجُري، وَأَبُوبَكْرٍ مُحَمَّد بن إبْراهيمِ الأَصْفَهانيّ، وَالدَّارَقُطْني، وَالْحاكِم، وَأَبُونَعيم، وَأَبُوعَبْدالرَّحْمَنِ السُّلَميّ،

وَأَبُوسَعيدالْمالينى، وَأَبُوعُثْمان الصَّابُونى، وَمُحَمَّد بن عَبْدالله الأَنْصارى، وَأَبُوبَكْرالبَيْهقى، وَخَلائَقُ لاَ يُحْصَوْنَ من الْمُتَقدِّمينَ وَالْمُتأَخِّرين، وَقَدْ اسْتَخَرْتُ الله تعالَى فى جَمْعِ أَرْبَعين حَديثاً، اقْتداءاً بهؤُلاء الأَئمَّة الأَعْلام وَحُفَّاظ الإسْلام، وَقَدْ إتَّفق الْعُلَماءُ عَلَى جَواز الْعَمَل بالْحَديث الضَّعيف فى فَضائِل الأَعْمال، وَمَعَ هَذا فَلَيْس إعْتمادى عَلَى هَذا الْحَديث، بَلْ عَلى قَوْلهﷺ فى الأَحادث الصَّحيحَة: ﴿لِيُبَلِّغ الشَّاهِدُ مِنْكُمُ الْغائبَ﴾. وَقَوْلهﷺ: ﴿نَضَّرَ اللهُ امْرءاً سَمِعَ مَقالَتى فَوَعاهَا فادَّاها كَمَا سَمِعَها﴾. ثُمَّ من الْعُلَماء مَنْ جَمَعَ الأَرْبَعين فى أُصول الدِّين، وَبَعْضُهُمْ فى الْفُرُوع، وَبَعْضُهُمْ فى الْجهاد، وَبَعْضُهُمْ فى الزُّهْد، وَبَعْضُهُمْ فى الآداب، وَبَعْضُهُمْ فى الْخُطَب، وَكُلُّها مَقاصدُ صالحَةٌ رَضيَ اللهُ عَنْ قاصديها،

---

وَأَبُوسَعيدالْمالينى، وَأَبُوعُثْمان الصَّابُونى، وَمُحَمَّدْ بن عَبْدالله الأَنْصارى، وَأَبُوبَكْرالبَيْهَقى، وَخَلائَقُ لاَ يُحْصَوْنَ منَ الْمُتَقدِّمينَ وَالْمُتَأَخِّرِينَ) جگه لەو زانایانه چەند كەسێكی تر كە نايەنە ژمار، له زانايانی پێشوو و دوايی، چل فەرموودەی پێغەمبەريانﷺ كۆ كردۆتەوە.

(وَقَدْ اسْتَخَرْتُ اللهُ تَعالَى فى جَمْعِ أَرْبَعينَ حَديثاً) ئيمامی (النواوی) ئەفەرموێ: منيش نوێژی ئيستيخارەم كرد بۆ ئەوەی خوا يارمەتيم بدا بۆ كۆكردنەوەی چل فەرموودەی پێغەمبەرﷺ (اقْتداءاً بِهؤُلاء الأَئمَّة الأَعْلاَمِ وَحُفَّاظ الإِسْلاَمِ) لەم كارەدا شوێنكەوتەی ئەو زانا بەرزانەی ئيسلام بوم: كە وەكو ئالای بەرز ديارن‌و پارێزەری ئايينی ئيسلامن.

(وَقَدْ إتَّفَقَ الْعُلَماءُ عَلَى جَوازِ الْعَمَلِ بِالْحَديث الضَّعيف فى فَضائِل الأَعْمال) زانايانی‌ئيسلام يەكدەنگن: كە دروستە بۆ كاروباری چاكە ئيش بە فەرموودەی بێهێز بكرێ، بەلام بۆ حەرام‌و حەلال ئەبی فەرموودەكە بەهێز بێ (وَمَعَ هَذا فَلَيْسَ إعْتمادى عَلَى هَذَا الْحَديث) لەگەل ئەوەشدا من پالم نەداوەتە سەر ئەم فەرموودە بێهێزە (بَلْ عَلَى قَوْلهﷺ: فى الأَحاديث الصَّحيحة) تەنها بۆ نووسينی ئەم چل حەديسە پالم داوەتە سەر فەرموودەكانی ڕاست، وەكو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: ﴿لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ مِنْكُمُ الْغائبَ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلم، با فەرموودەكانی من ئەوەی لێرەيە، بگەيەنێ بەوەی لێرە نيە. (وَقَوْلهﷺ) هەروەها وەك فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: ﴿نَضَّرَ اللهُ امْرأً سَمِعَ مَقالَتى فَوَعاهَا فأَدَّاها كَمَا سَمِعَها﴾ رواهُ الترمذي، خوا ڕووی ئەو كەسە جوان بكا: كە گوێی لە فەرموودەكانی منەو هەلی‌ئەگرێ جا بە تەواوی ئەيگەيەنێتە موسولمانان.

(ثُمَّ منَ الْعُلَماء مَنْ جَمَعَ الأَرْبَعينَ فى أُصُول الدِّين، وَبَعْضُهُمْ فى الْفُرُوع، وبَعْضُهُمْ فى الْجهاد، وبَعْضُهُمْ فى الزُّهْد، وَبعْضُهُمْ فى الآداب، وَبَعْضُهُمْ فى الْخُطَبِ) ئينجا هەندێ لەو زانايانە ئەم چل حەديسەيان كۆ كردۆتەوە لەو جۆرەی بناغەی ئايينە، وە هەندێك لەوانەی لقی ئايينە، وە هەندێك لە جيهاد، هەندێك لە واز هێنانی دونيا، هەندێك لە ڕەوشت، هەندێك لە ووتارەكانی پێغەمبەرﷺ (وَكُلُّها مَقاصِدُ صالِحَةَ رَضِىَ اللهُ عَنْ قاصِديها) كاری ئەم بەڕێزانە بە كاری باش دائەنرێن، خوا لێيان ڕازی بێ.

وَقَدْ رَأَيْتُ جَمْعَ أَرْبَعِينَ أَهَمَّ مِنْ هَذا كُلِّه، وَهِيَ أَرْبَعُونَ حَدِيثاً مُشْتَمِلَةً عَلَى جَمِيعِ ذَلِكَ، وَكُلُّ حَدِيث مِنْها قَاعِدَةٌ عَظِيمَةٌ مِنْ قَواعِدِ الدِّين، فَقَدْ وَصَفَهُ الْعُلَماءُ: بِأَنَّ مَدارَ الإِسْلامِ عَلَيْه، أَوْ هُوَ نِصْفُ الإِسْلامِ، أَوْ ثُلُثُهُ أَوْ نَحْوِ ذَلِكَ، ثُمَّ الْتَزِمُ مِنْ هَذِهِ الأَرْبَعِينَ أَنْ تَكُونَ صَحِيحَةً، وَمُعْظَمُها فِي صَحِيحَيِ الْبُخارِي وَمُسْلِم-رضي الله عنهما- وَأَذْكُرُهَا مَحْذُوفَةَ الأَسانِيد، لِيَسْهُلَ حِفْظُها، وَيَعُمَّ الإِنْتِفاعُ بِها إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى، ثُمَّ أُتْبِعُها بِبابٍ فِي ضَبْطِ خَفِيِّ أَلْفاظِها، وَيَنْبَغِي لِكُلِّ راغِبٍ فِي الآخِرَةِ أَنْ يَعْرِفَ هَذِهِ الأَحادِيثَ لِما اشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ مِنَ الْمُهِمَّات، وَاحْتَوَتْ عَلَيْهِ مِنَ التَّنْبِيهِ عَلَي جَمِيعِ الطَّاعات، وَذَلِكَ لِمَنْ تَدَبَّرَهُ، وَعَلَى اللهِ إِعْتِمادِي وَإِلَيْهِ تَفْوِيضِي وَإِسْتِنادِي،

---

(وَقَدْ رَأَيْتُ جَمْعَ أَرْبَعِينَ) بەڕاستی منیش بە باشم زانی: چل حەدیس کۆ بکەمەوە (أَهَمَّ مِنْ هَذا كُلِّه) لە هەمووی ئەوان گرنگتر بێ (وَهِيَ أَرْبَعُونَ حَدِيثاً مُشْتَمِلَةً عَلَى جَمِيعِ ذَلِكَ) ئەوەی کۆم کردۆتەوە، چل حەدیسە، کە بریتی‌یە لە هەندێك ئەوان بە گشتی (وَكُلُّ حَدِيثٍ مِنْها قَاعِدَةٌ عَظِيمَةٌ مِنْ قَواعِدِ الدِّين) هەر حەدیسێکی من هێناومە لەو چل حەدیسە، بنکەیەکی گەورەیە لە بنکەی ئایین (فَقَدْ وَصَفَهُ العُلَماءُ: بِأَنَّ مَدارَ الإِسْلاَمِ عَلَيْه) هەر حەدیسێك لەو چلە، زانایان ئەڵێن: کاروباری ئیسلامی لە سەر ئەخولێتەوە (أَوْ هُوَ نِصْفُ الإِسْلاَمِ، أَوْ ثُلُثُهُ أَوْ نَحْوِ ذَلِك) یان ئەڵێن: نیوەی ئایینە، یان سێیەکی ئایینە، یان چوارێکە.

(ثُمَّ الْتَزِمُ مِنْ هَذِهِ الأَرْبَعِينَ أَنْ تَكُونَ صَحِيحَةً) وا ئەخەمە سەر شانی خۆم، ئەم چل حەدیسە هەمووی ڕاست بێ (وَمُعْظَمُها فِي صَحِيحَيِ البُخارِي وَمُسْلِم رضي الله عنهما) زۆربەی ئەم حەدیسانەم وەرگرتوە لە کتێبی ئیمامی (بوخاری)و ئیمامی (موسلیم)، خوا لێیان ڕازی بێ. کە لە هەموو کتێبی داندراو ڕاستترن.

(وَأَذْكُرُهَا مَحْذُوفَةَ الأَسانِيد لِيَسْهُلَ حِفْظُها وَيَعُمَّ الإِنْتِفاعُ بِها إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى) بە شێوەیەکی کورت ئەم حەدیسانە ئەنوسمەوە، ناوی ئەو کەسانەی گێڕاویەتیانەوە نانووسم بۆ ئەوەی زوو لەبەری بکەن‌و کەڵکی لێوەربگرن، إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى (ثُمَّ اتبعُها ببابٍ) لە دوای ئەمەش کە حەدیسەکان ئەڵێم، چەند ووشەیەك ئەنووسم (فِي ضَبْطِ خَفِيِّ أَلْفاظِها) بۆ ئەوەی ووشە گرانەکان ڕوون بکەمەوە. جا بزانە: ئێمە ئەو ووشانە نانوسین چونکە حەدیس نین.

(وَيَنْبَغِي لِكُلِّ راغِبٍ فِي الآخِرَة) پێویستە لە سەر هەموو کەسێك کە ڕۆژی دواییان بوێ (أَنْ يَعْرِفَ هَذِهِ الأَحادِيث) ئەم چل حەدیسە بزانێ (لِمَا اشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ مِنَ الْمُهِمَّات) چونکە هەموو شتێکی گرنگیان تێدایە (وَاحْتَوَتْ عَلَيْهِ مِنَ التَّنْبِيهِ عَلَى جَمِيعِ الطَّاعات) هەروەها هەموو ئاگاداری‌یەکی خواپەرستییان تێدایە (وَذَلِكَ لِمَنْ تَدَبَّرَهُ) ئەم سوودە بە کەسێك ئەگا کە بە ووردی بیری لێبکاتەوە (وَعَلَى اللهِ إِعْتِمادِي) پشتی خۆم هەر بە خوا ئەبەستم (وَإِلَيْهِ تَفْوِيضِي وَإِسْتِنادِي) هەموو کارێکی خۆم هەر بە خوا ئەسپێرم، هەر ئەو پاڵپشتمە

(وَلَهُ الْحَمْدُ وَالنِّعْمَةُ) سوپاس هەر شایانی ئەو خودایەیەو هەر ئەو چاکەی بە سەر ئێمەدا هەیە (وَبِهِ التَّوْفِيقُ وَالْعِصْمَةُ) توانای خواپەرستی هەر بە دەست ئەوەو خۆپاراستن لە گوناه هەر بە دەست ئەوە، خوایە یارمەتیمان بدە بۆ خواپەرستیو بۆ وازهێنان لە تاوانەکان آمین.

لێرەدا پێشەکی‌ی ئیمامی (النواوی)–کە کۆکەرەوەی ئەم چل حەدیسەیە– کۆتایی هات.

## ﴿ چەند زانستێکی حەدیس ﴾

١- **پێناسەی‌حەدیس:** (حدیث): یان فەرموودەی‌پێغەمبەرە ﷺ، یان کرداری‌پێغەمبەرە ﷺ، یان ڕازی‌بوونی‌پێغەمبەرە ﷺ: بە کرداری، یان بە گوفتاری کەسێکی‌تر.

٢- **بزانە:** هەروەك پێویستە موسوڵمان ڕەفتار بە قورئان بکا: وەهاش پێویستە ڕەفتار بە حەدیس بکا، بەڵام بەو مەرجەی حەدیسەکە: یان (صحیح) بێ، یان (حسن) بێ.

٣- **حەدیسی ( حسن ):** زانایانی (علوم الحدیث) فەرموویانە: حەدیسی (حسن) دوو جۆرە: **یەکەم:** (حسن لذاته)، کە ئەوەیە: نە لە (سند)و نە لە (متن)ی حەدیسەکەدا هیچ نیشانەی (ضعیف) بێ‌هێزی نەبێ.

**دووەم:** (حسن لغیره) کە ئەوەیە: (سند)ی حەدیسەکە (ضعیف) بێ، بەڵام: یان لە زۆر ڕێگاوە ئەم حەدیسە هاتبێ، وەکو حەدیسی (لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ) بڕوانە حەدیسی (٣٢)، یان (متن)ی حەدیسەکە لەگەڵ حەدیسێکی تری (صحیح)دا تێك بکاتەوە: وەکو حەدیسی (مَنْ زارَ قَبْرِي وَجَبَتْ لَهُ شَفَاعَتِي). ئیمامی (النواوی) بە بێ‌هێزی داناوە، بەڵام (متن)ی ئەم حەدیسە تێك ئەکاتەوە لەگەڵ حەدیسی (كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوها فَإِنَّها تُذَكِّرُ الآخِرَةَ) رواهُ مُسْلِم، کەوابوو: ئەبێتە (حَسَن لغیره)و بەکار دێ.

٤- **حەدیسی ( ضَعیف ) بێ‌هێز:**

- ئیمامی (شافعی) ئەفەرموێ: حەدیسی (ضعیف) بەکار دێ بۆ بڕیارەکانی شەرعی ئەگەر پێشەوایانی ئایین بە تێکڕایی پێی ڕازی بنو قبوڵی بکەن.
- ئیمامی (أحمد) ئەفەرموێ: حەدیسی (ضعیف) بەلای منەوە خۆشەویستترە لە بیروڕای خاوەن ڕایەك، بەو مەرجەش بەکار دێ: کە دژایەتی نەبێ. واتە: لەگەڵ قورئانو حەدیسێکیتری (صحیح)، یان (حسن).
- ئیمامی (النواوی) ئەفەرموێ: زانایانی شەرعو حەدیس فەرموویانە: دروستە حەدیسی (ضعیف) بەکار بێ، بۆ کاری چاکە. واتە: نەك بۆ (واجب)و (حلال)و (حرام).
- (ابن حجر الهیتمی) ئەفەرموێ: ئەگەر کەسێك دیتی: پێشەوایەکی حەدیس زان، حەدیسێکی بە (صحیح)، یان بە (حسن) داناوە، دروستە شوێنکەوتەی بیو بۆخۆی کار بەم حەدیسە بکا.

## (اَلْحَدِيثُ الأَوَّلُ: فِي الإِخْلاَصِ)

﴿ عَنْ أَميرِالْمُؤمنين عُمَرَ بنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى،

---

٥- **حەدیسی (موضوع)، واتـه:** داندراو، بەو حەدیسە ئەگوترێ: کە یەکێك لەخۆیەوە داینابێو بە درۆ نیسبەتی بداتە لای پێغەمبەرﷺ.

**ئینجا بزانه:** نووسینو گێڕانەوەی حەدیسی (موضوع) دروست نیە، تەنها بە مەبەستی ئاگادارکردنەوەی خەڵك نەبێ: لەم درۆیانە، تاکو خۆیان لێی بپارێزن.

### ﴿ حەدیسی یەکەم: بێگەردی لە خوا پەرستندا ﴾

(عَنْ أَميرِالمُؤْمِنِين) گێڕدراوەتەوە لە فەرمانڕەوای موسوڵمانان (عُمَرَ بن الْخَطَّاب رضي الله عنه) حەزرەتی (عومەر)ی کوڕی (خەتتاب)، جگە لەم ناوە، پێغەمبەرﷺ ناوی ناوە: بە (الفاروق)، بە سێزدە ساڵ لە دوای لە دایکبوونی پێغەمبەرﷺ، لە (مکة)ی پیرۆز لە دایك بووە، هەر لە (مكة) لە تەمەنی (٣٣) ساڵیدا لە خزمەت پێغەمبەرﷺ موسوڵمان بووە، ئینجا لە (مکة) کۆچی کردوە بۆ (مدينة)، ئینجا لە ڕۆژی وەفاتی حەزرەتی (أبوبکرالصديق)-خوا لێی ڕازی بێ- کرایە جێنیشی پێغەمبەرﷺ، یەکەم کەس بوو ناویان نا بە (أميرالمؤمنين)، لە (٢٦)ی (ذي‌الحجة) ساڵی (٢٣)ی کۆچی بە دەستی دیانێکی فارس کە ناوی (فەیرۆز) ئەبولوئلوئە بوو، شەهید کرا، لە تەنیشت پێغەمبەرﷺ نێژراوە، تەمەنی (٦٣) ساڵ بوو، (١٠) ساڵو نیو فەرمانڕەوایی موسوڵمانانی کردوە.

ئەم بەڕێزە ئەفەرموێ: (سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ) گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو ئەیفەرموو: (إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ) کاروکردەوەکانی ئادەمیزاد بە نیازو خواستی ناو دڵی نەبێ دانامەزرێ (وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى) هەموو کەسێك هەر پاداشو سزای نیازو خواستی ناو دڵیخۆی پێ ئەگا.

**بزانـه:** (نِيَّة) ئەوەیە: نیازی ناو دڵت -لەو ئیشەی ئەیکەی- بۆ خوا بێ.

**هەروەها بزانه:** مەبەست بەو کردەوەی نیەتی ئەوێ: کردەوەی خواپەرستیە، کەوابوو: ئەگەر خواردن بخۆی بۆ بەهێزبوون بۆ خواپەرستی: ئەوەش خواپەرستیە.

جا لە کاروباری خواپەرستیدا بوێ نیەت پێویستە، تاکو لە کاروباریتری ڕۆژانەو جارجارەمان جیا ببێتەوە.

واتە: شۆرینی خۆت ئەگەر بۆ پاککردنەوە بێو بەس: ئەمە خواپەرستی تێدا نیە چونکە ئەوەی موسوڵمانیش نیە ئەو کارە ئەکا، بەڵام ئەگەر بۆ خواپەرستی بێ، بەو نیازە لەویتر جیا ئەبێتەوەو ئەبێتە خواپەرستی، کەوابوو: ئەبی بۆ خۆشۆرین لە جەنابەت نیەت بهێنێ.

**هــەروەها بزانــە:** مەبەسـت بـە (نیـەت) نیـازی نـاو دڵـە، زوبـان هـیچ پەیوەنـدی‌ی بە دروستبوونیەوە نیە، بەڵام ئیمامی (النـواوي) ئەفـەرموێ: سـوننەتە بـە زوبـانیش نیـەت بێنێ تاكو یارمەتی دڵ بدا.

**هەروەها بزانە:** هەرچـی وازلێهێنـان بـێ، بـۆ دروسـتبوونی نیـەتی نـاوێ: وەكـو شـۆڕینی پیسایی‌و وازهێنان لە خراپە، بەڵام ئەگەر پاداشتی لای خوات بوێ، ئەبی نیەتی بـۆ بـێنی، هەروەها: هەر خواپەرستیەك بە نیازی دونیا بیكەی پاداشتی لای خوات لە دەست ئەچـێ، وەكو جیهاد: ئەگەر تەنها بۆ سوپاسی خەڵك بێ، یان بۆ وەدەستهێنانی پلەیەك بێ، ئەمـە بۆ خوا نیەو پاداشتت بۆ نانووسرێ.

ئینجا كە ئەمەت زانی، بۆت ڕوون بۆوە ئەبی بۆ نوێـژو زەكـاتو ڕۆژوو و حـەج، نیـەت بێنـێ، جگە لەمانەش هەرچـی لای خواپەرسـتی‌ی تێدابـێ، نیـەتی ئـەوێ: وەكـو بەخشـینی شـتێك ئەگەر بۆ خوا بێ جیایە، ئەگەر بۆ دونیا بێ جیایە، بە پێ‌ی نیەتەكەت بۆت ئەنووسرێ.

(فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَىاللهِ وَرَسُولِه) هەركەسـێك كۆچـكردنی لـە شـوێنێك بـۆ شـوێنێكی‌تر، بـۆ ڕازی‌بوونی خـواو پێغەمبەرﷺ بێ (فَهِجْرَتُهُ إِلَىاللهِ وَرَسُولِه) ئەوە كۆچكردنەكەی لە لای خـواو پێغەمبەرﷺ ڕەوایەو خوا پاداشتی كۆچكردنەكەی بە تەواوی بۆ ئەنووسێ.

**جــا بزانــە:** مەبەسـت لـە كۆچـكردن: بەجێهێشـتنی وڵاتێكـی كافرنشـینەو بچێتە وڵاتـی ئیسلام، ئینجا ئەگەر موسـوڵمان ئـەیتوانی لـە نـاو وڵاتی‌كوفر، ئایینی‌ئیسلام ئاشـكرا بكـاو بە خەڵكی ڕابگەیەنێ، ئەوە مانەوەی باشترە لە كۆچكردن، بـەڵام ئەگـەر نەیئـەتوانی ئـایینی خۆی ئاشكرا بكاو بە خەڵكی ڕابگەیەنێ، ئەوە پێویستە كۆچ بكا، جا ئەگەر لەگـەڵ ئەوەشـدا مانەوەی لەوێ سوودێكی بۆ ئیسلام تێدا بوو، دیسان مانەوەی باشترەو بـا خواپەرسـتی بـە نهێنی بكا، هەروەها لە وڵاتی‌ئیسلامیش: ئەگەر خواپەرستی ڕاسـتەقینەی بـۆ نەئـەكرا، یـان زۆرداری‌و بێ‌ئەخلاقی‌و گوناهكردن بە ئاشكرا بـوو، یـان حـوكم بـە قورئـانی پـیرۆز نەئـەكرا، دیسان كۆچكردن واجبە بۆ شوێنێكی باش، ئەگەر هەبێ.

بەڵام ئەگەر هاتوو یەكێكی لێهاتوو ڕاپەڕی‌و داوای حوكمی قورئانی ئەكردو بۆمان ڕوَن بـۆوە: كـە ڕاسـت ئـەكا، ئـەبی یارمـەتی بـدەین‌و تێبكۆشـین بـۆ گەڕاندنـەوەی حـوكمی قورئـان‌و نەهێشتنی زۆرداری‌و بەدڕەوشتی، جا ئەگەر كەس لەگەڵی ڕانەپەڕی هەموویان تاوانبار ئـەبن، كەوابوو: كۆچكردن واجب ئەبێ وەكو گوتمـان ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِـيُّﷺ: لاَ هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ وَلَكِـنْ جِهَـادٌ وَنِيَّـةٌ، وَإِذَا اسْـتُنْفِرْتُمْ فَـانْفِرُوا﴾ رواهُ الشّيخان، واتـە: لەمــەودوا كۆچــكردن لــە مەككــە واجــب نیــە، چــونكە بووەتــە (دارُ الإِسْـلام)، بــەڵام

وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوْ إِمْرَأَة يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ ﴾ رواهُ إماما الْمُحَدِّثِين: أَبُوعَبدالله محمدُ بنُ إسماعيل بن إبراهيمَ بن الْمُغيرة بن بَرْدِزْبَه البخاري، وَأَبوالْحُسَين مُسلم بن الْحَجَّاج بن مسلم الْقُشَيْرِيّ النيسابوريّ، في صَحِيحيهما اللّذَيْن هُما أصحُّ الْكُتُب الْمُصَنَّفَة.

---

تێکۆشان بە دڵێکی بێگەرد بۆ بەرزی ئیسلام هەر بەردەوامە، جا ئەگەر داوای ڕاپەڕینتان لێکرا بۆ جیهاد، ئێوەش ڕاپەڕن.

(وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا) بەڵام هەرکەسێك کۆچکردنی بۆ وەدەستهێنانی کەلوپەلی دونیا بێ (أَوْ إِمْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا) یان کۆچکردنی بۆ مارەکردنی ژنێك بێ (فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ) ئەوە کۆچکردنەکەی هەر بۆ دونیاو ژن هێنانە، خێری بۆ نانووسرێ.

جا ئەی موسوڵمانی بەڕێز: لە هەموو کارو کردەوەیەکت نیازت هەر خودا بێ، ئەگەر ووڵاتی خۆت بەجێ هێشت بۆ قازانجی دونیا، مەڵێ: بۆ خودا کۆچم کردوە. چونکە ئەوە لە لای خوا بە تاوان ئەنووسرێ.

(رواهُ إماما الْمُحَدِّثِين) ئەم حەدیسە دوو پێشەوای حەدیس گێڕاویەتیانەوە:

١- **ئیمامی بوخاری** کە پێی ئەگوترا (أَبُوعبدالله)، ناوی خۆی (محمدُ بنُ اسماعيلَ بن إبراهيمَ بن الْمُغيرة بن بردِزْبه) بوو، (البخاري) خەڵکی (بوخارا) بوو: کە شارێکە لە (ئۆزبەکستان)، لە ساڵی (١٩٤)ی کۆچی لە دایك بووە، لە ساڵی (٢٥٦)ی کۆچی شەوی جەژنی ڕەمەزان لە گوندی (خرتەنگ) کۆچی دوایی کردوە.

٢- **ئیمامی موسلیم** کە پێی ئەگوترا (أبوالحسَين) ناوی خۆی (مُسلم بن الْحَجَّاج بن مسلم القشيريّ النّيسابوريّ) بوو، (نەیسابور) شارێك بووە لە خوراسان ئێستا وێرانە، لە ساڵی (٢٠٤)ی کۆچی لە (نەیسابور) لە دایك بووە، لە (٢٦١)دا، کۆچیدوایی کردوە لە (نەیسابور).

(في صَحِيحيهما اللّذَيْن) هەردووکیان ئەم حەدیسەیان گێڕاوەتەوە لە هەردوو کتێبە ڕاستەکەیخۆیان: کە (هُما أصحُّ الكُتب الْمُصَنَّفَة) کتێبەکەی ئیمامی(بوخاری)و کتێبەکەی ئیمام (موسلیم) لە هەموو کتێبێك ڕاسترن لە پاش قورئانی پیرۆز.

**ئینجا بزانە:** (البخاری)و (مسلم) لە زاراوەی حەدیسدا، پێیان ئەگوترێ: (الشیخان)، واتە: کە ئەڵێن: (رواه الشیخان) مەبەست ئەم دوو بەڕێزەنە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّات): هەرکەسێك بە دڵ نیازی هەبوو چاکەیەك بکا، بەڵام کۆسپ هاتە ڕێیو پێی نەکرا: ئەوە پاداشتی چاکەکەی هەر بۆ ئەنووسرێ، بۆ نموونە: پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَا مِن امْرِئٍ تَكُونُ لَهُ صَلاَةٌ بِلَيْلٍ يَغْلِبُهُ عَلَيْهَا نَوْمٌ إِلاَّ كُتِبَ لَهُ

## (اَلْحَدِيثُ الثَّانِي: فِي مَرَاتِبِ الدِّينِ: اَلإِسْلَامِ، اَلإِيمَانِ، اَلإِحْسَانِ)

﴿عَنْ عُمَرَ بنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ وَلاَ يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلَامِ؟

---

أَجْرُ صَلاَتِه﴾ رواهُ أبوداود والنّسائي، هەركەسێك شەونوێژی كردبوە عادەتیخۆیو خەو بە سەریدا زاڵ بوو و پێی نەكرا شەونوێژەكەی بكا، خوای گەورە خێری شەونوێژەكەی بۆ ئەنووسێ بە هۆی نیازە باشەكەی.

٢- (وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى): وا ئەگەیەنێ: كە نیازی ناو دڵ كار ئەكاتە سەر حەرامو حەلاڵ، بۆ نموونە: تەماشاكردنی ئافرەتی بێگانە بۆ لەزەت وەرگرتن حەرامە، بەلام بە نیازی داخوازیو مارەكردن خێرە، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكردوە.

٣- (فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ): وا ئەگەیەنێ: هەر كەسێك بە نیازی تاوانكاریەك بڕواتە شوێنێك، ئەوە كۆچكردنو سەفەرەكەشی تاوانە، كەوابوو: تەیەمومو قەسرو جەمعی نوێژو شكاندنی ڕۆژووی ڕەمەزان: هیچی بۆ دروست نیە.

## ﴿حەدیسی دووەم: پلەكانی ئایین: ئیسلام، ئیمان، چاكە﴾

(عَنْ عُمَرَ بنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ) گێڕدراوەتەوە لە ئیمامی (عومەر)، ئەفەرموێ: (بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ) جارێك لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوین (ذَاتَ يَوْمٍ) ڕۆژێك لە ڕۆژان (إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ) لە ناكاو پیاوێكمان هاتە بەرچاو (شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ) جلو بەرگی زۆر سپی بوو (شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ) مووی ڕیشی زۆر ڕەش بوو (لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ) نیشانەی ڕێبواریی لێنەئەبینرا (وَلاَ يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ) هیچ كەس لە ئێمە نەیئەناسی (حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ) تا لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشت (فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ) هەردوو ئەژنۆی خۆی بە هەردوو ئەژنۆی پێغەمبەر ﷺ نوساند (وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ) هەردوو دەستەكانی خۆی دانا سەر هەردوو ڕانەكانی خۆی، وەكو قوتابی لە بەردەم مامۆستادا.

ئەی موسوڵمان: تۆش ئەوها جلو بەرگت خاوێن بێو ڕوخسارت ڕێك بێو لە بەردەم زانایانی ئایینی بە ئەدەب دانیشە، لە پرسیار كردن شەرم مەكە.

(وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ ﷺ) ئەو پیاوە نەناسراوە گوتی: ئەی محمد (أَخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلَامِ) پێم بڵێ ئایینی ئیسلام لە چەند شت پێك هاتوە؟.

**ئینجا بزانە:** بانگ كردنی پێغەمبەر ﷺ بە ناوی خۆی، یان ناوهێنانی بە ناوی خۆی، دروست نیە، تەنها بۆ خوداو مەلائیكە دروستە، بۆیێ حەزرەتیجوبرائیل لێرەدا بانگی كرد بە (محمد)، بەلام ئەبی ئێمەی ئادەمیزاد بە پێغەمبەرایەتی ناوی بلێین.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اَلإِسْلاَمُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَّسُولُ اللهِ، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ،

---

(فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ) پێغەمبەر ﷺ لە وەڵاما فەرمووی (اَلإِسْلاَمُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَّسُولُ اللهِ) یەکەم شت لە ئیسلامدا ئەوەیە: بە دڵ باوەڕت هەبێو بە زوبان بڵێی: جگە لە زاتی(الله) هیچ خودایەك نیەو (محمد) نێردراویخودایە، ئەو پێغەمبەری هەموو دونیایە.

**بزانە:** پێویستە بۆ دروستبوونی ئیسلامەتی: ووشەی (أَشْهَدُ) دووبارە بکرێتەوەو بگوترێ: ﴿أَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًارَّسُولُ اللهِ﴾. ئەبی (أَنْ لاَ) بە (أَلاَّ) بخوێندرێتەوە.

هەروەها دروستە: هەرکەس بە زمانی خۆی شادەو ئیمان بێنێو مەرج نیە بە عەرەبی بێ، بەڵام پێویستە لە هەموو زمانێك ووشەکانی شەهادە بە دوای یەکدا بێن، بەو جۆرەی نووسیومانە.

**بزانە:** دووبارەکردنەوەی (أَشْهَدُ) لە بانگدان پێویستە، لە تەحیاتی نوێژدا پێویست نیە، بەڵام (وَ)=پیتی واو لە بانگدا نابێ هەبێو لە تەحیاتا پێویستە هەبێ، ئەمە پوختەی فەرموودە بەهێزەکانی مەزهەبی (شافعی)یە خوا لێی ڕازی بێ.

(وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ) دووەم شت لە ئیسلامدا ئەوەیە: هەر پێنج نوێژەکان بە هەموو مەرجەکانەوە بکەی لە کاتیخۆیاندا، ئەگەر کاتی خۆیشی تێپەڕی، ئەبی هەر بیکەی، بە جۆرێکی وا: ئەگەر چەند ساڵ نوێژت نەکردبێ، ئەبی هەموویان بگەڕێنیەوەو قەزایان بکەیەوە.

**جا بزانە:** زۆر لە زانایانیئیسلام فەرموویانە: نوێژنەکەر کافرە. بەڵام کۆمەڵێ زۆرتر لە زانایان ئەفەرموون: کافر نیە، بەڵکو (فاسق)ە ئەگەر باوەڕی بە نوێژ هەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا، هەردوو لا ئەفەرموون: ئەبێ نوێژنەکەر بکوژرێ.

(وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ) سێیەم شت لە ئیسلامدا: ئەبی زەکات بدەی، زەکات ئەمەیە: مرۆڤی هەبووی نەختێك ماڵیخۆی ئەداتە مرۆڤی نەبووی، ساڵێ یەکجار، بە مەرجێ بگاتە ڕادەی زەکات: ئەگەر پارەی هەبوو نرخی(١٤٠) میسقالی زیو زەکاتی تێدایە: لە چل بەش: یەك بەش زەکاتە، واتە: لە سەدا دووو نیو، ماڵی بازرگانیش هەروەهایە.

لە دانەوێڵە: لە چل تەنەکە بە تەنەکەی نەوت چوار تەنەکە زەکاتە. لە ڕەشەووڵاغ لە سی سەر: یەك گوێلکی نێری یەك ساڵە، وە لە چل سەر: یەك گوێلکی مێی دوو ساڵە. لە مەڕو بزن لە چل سەر: یەك بزنە، یان یەك مەڕە، لە (١٢١): دوو، لە (٢٠١): سێ، لە (٤٠٠): چوار.

هەروەها سەرفیترەی ڕەمەزان لە جیاتی خۆتو ژنو منداڵت، دوو کیلۆ دانەوێڵە، یان نرخەکەی ئەبی بیدەی بە هەژار، لە سەر فەرموودەی ئیمام (أبوحنیفە رضي الله عنه).

وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِن اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً. قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ؟ قَالَﷺ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ،

---

(وَتَصُومَ رَمَضَانَ) چوارەم شت لە ئیسلامدا: بە ڕۆژوو بوونی مانگی ڕەمەزانە، ڕۆژوو لە ئیسلامدا ئەوەیە: لە بەرە بەیانەوە تا ڕۆژئاوابوون خۆت قەدەغە بکەی لە خواردنو خواردنەوەو خۆ ڕشاندنەوەو دەستبازی کردن لەگەڵ ئافرەتو لەشی خۆت، بەم جۆرە شتانە ڕۆژوو لە دەست ئەچێ، بەڵام بە جوێن دانو گفتوگۆی پڕوپووچو باسکردنی خەڵك بە خراپەو بە درۆ کردن، خێری کەم ئەبێتەوە.

(وَتَحُجَّ الْبَيْتَ) پێنجەم شت لە ئیسلامدا: حەج کردنە (إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً) ئەگەر توانای چوونو گەڕانەوەت هەبێ، واتە: ئەبی خانوو و خواردەمەنی منداڵو ژنەکەت دابین بکەی تا ئەگەڕێیتەوە، قەرزی خەڵك بدەیەوە. حەج کردن لە ئیسلامدا ئەمەیە: لە تەمەن یەکجار بچیتە ماڵیخوا، لە (مەککە)ی پیرۆز، لەوێ چەند جۆرە خواپەرستییەك هەیە بیکەی، ئەبی بەر لە چوونە حەج، لە گوناهەکانت تۆبە بکەیت، ئەگەر مافی خەڵکت لە سەر بێ، ئەبی بیاندەیەوە، یان ڕازییان بکەی، لە دوای گەڕانەوەت دەست بە گوناه کردن نەکەیەوە.

جا کە چووی بۆ حەج، بە تایبەتی بڕۆ (مەدینە)ی پیرۆز بۆ سەردانی گۆڕی حەزرەتی رسول اللهﷺ لە مزگەوتی پێغەمبەرﷺ نوێژ بکەو لە خوا بپاڕێوە: تا لە تاوانی خۆتو دایكو باوکت خۆش بێو لە ئوممەتی پێغەمبەرﷺ جیات نەکاتەوە. ئینجا سەلام لە ئیمامی (أبوبکر)و ئیمامی (عمر) بکە، هەردووکیان لە تەنیشت پێغەمبەرﷺ نێژراون.

ئەم پێنجانە پێیان ئەگوترێ: پێنج ڕوکنی ئیسلام. هەرکەسێك باوەڕی نەبێ بە واجببوونی یەکێك لەم پێنجانە، کافر ئەبێ.

(قَالَ: صَدَقْتَ) ئەم پیاوە نەناسراوە گوتیە پێغەمبەرﷺ ڕاست ئەکەی (قَالَ: فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ) ئیمامی (عمر) فەرمووی: پێمان سەیر بوو: ئەو پیاوە پرسیاری لێئەکاو پێشی ئەڵێ: ڕاست ئەکەی!. (قَالَ) دووبارە پیاوە نەناسراوەکە پرسیاری کردو گوتی (فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ) پێم بڵێ ئیمان چییە؟

**بزانە:** ئیمان بیروباوەڕی ناو دڵە بەو شەش ڕوکنانەی پێغەمبەرﷺ لە وەڵامدا ژماردونی، هەر کەسێك بە یەکێك لەو شەشانە باوەڕی نەبێ ئەوە کافر ئەبێ.

(قَالَ) پێغەمبەرﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: (أَنْ تُؤْمِنَ) ڕوکنییەکەمی ئیمان ئەوەیە: باوەڕت هەبێ (بِاللهِ) بە هەبوونی خوا، کە هەر هەبووەو هەر دەمێنێ، زیندووەو نامرێ، هەموو شت دەزانێ: چ نهێنی چ ئاشکرا، دەبیسیو دەبینێ، لە تاریكو ڕووناکی، توانای هەموو شتێکی هەیە بیکا، هەرچی بیەوێ دەیکا، گفتوگۆی هەیە بێ پیتو دەنگ، لە هیچ شوێنێ نیشتەجێ نیە، هیچ شتێك وێنەی خودا نیەو خودا وەك هیچ شتێك نیە، پێویستی بە هیچ

شتێك نیه، هەموو شتێك ئەو دروستی كردوەو هەر ئەو دروستی ئەكا، ژیانو مردنو خۆشیو ناخۆشیو بوونیو هەژاری، هەمووی بە دەست ئەو خودایەیە.

(وَمَلائكَته) رووكنیدووەمی ئیمان: باوەڕهێنانە بە هەبوونی فریشتەیخوا لە ئاسمانو زەمین.

**پێناسە:** ئەو فریشتانە چینێكن خوایگەورە لە ڕووناكی دروستی كردون، ئەتوانن بە هەموو شێوەیەك خۆیان بنوێنن، نە نێرن نە مێنن، خەو و خواردنیان نیە، لە فەرمانی خوا دەرناچن. لەو فریشتانە چواریان پلەی بەرزیان هەیە:

**یەكەم:** (جُبْرائیل) وەحی ئەهێنێ بۆ پێغەمبەرانﷺ. **دووەم:** (میكائیل) بارانو ڕزق جێبەجێ ئەكا. **سێیەم:** (عزرائیل) گیانی گیانلەبەر وەرئەگرێ. **چوارەم:** (إسرافیل) چاوەڕوانی دونیا تێكدان ئەكا.

جگە لەمانە: فریشتەی خوا لە بەهەشتیش هەن: گەورەكەیان ناوی (رِضْوان)ە. هەروەها دوو فریشتەیتر بە ناوی (مونكەرو نەكیر) پرسیار لە مردوو ئەكەن، (كِرامٌ كاتبین) كردەوەی ئادەمیزاد ئەنوسن، نۆزدە فریشتەیتر كارگێڕی جەهەننەمن پێیان ئەگوترێ: (زَبانیَّة). گەورەكەیان ناوی (مالك)ە، جگە لەمانەش، فریشتە زۆرن هەر خودا بەخۆی ئەزانێ ژمارەیان چەندە.

(وكُتُبِه) ڕوكنیسێیەمی ئیمان ئەوەیە: باوەڕت هەبێ بەو كتێبانەی بۆ پێغەمبەران-علیهم الصلاة والسلام- هاتون لە لای خوا، كە هەموویان فەرموودەی خودان، وەكو سوحوفی حەزرەتی (ئیبراهیم) پێغەمبەر، تەوراتی حەزرەتی(موسی) پێغەمبەر، زەبووری حەزرەتی(داود) پێغەمبەر، ئینجیلی حەزرەتی(عیسی) پێغەمبەر-علیهم الصلاة والسلام-. ئینجا قورئانیپیرۆز بۆ پێغەمبەری ئاخیر زەمان حەزرەتی(محمدالمصطفیﷺ)، بە هاتنی قورئانی پیرۆزو ئەوانیتر هەموو (نەسخ)=بێكار بون، چونكە جگە لە قورئان هەموو دەستكارییان تێدا كراوە.

(وَرُسُلِه) ڕوكنیچوارەمی ئیمان ئەمەیە: باوەڕت هەبێ بە هەموو پێغەمبەرانی خوا-علیهم الصلاة والسلام- كە ئەوانیش پیاونو ڕاستگۆو ژیرو نەترسن، هەرچی خودا بفەرمووێ بە خەڵكی ڕائەگەیەنن. ژمارەیان (١٢٤٠٠٠) سەدو بیستو چوار هەزار پێغەمبەرە-علیهم الصلاة والسلام-، هەروەكو (ابن حبان)و (حاكم) لە (أبوذر) گێڕاویەتیانەوە.

**پێناسە:** پێغەمبەر پیاوێكە خوا ناردویەتی بۆ ئەوەی بەرنامەی خوا بە ئادەمیزادان ڕابگەیەنێو بە خۆیشی ڕەفتاری پێبكا، ئەمە پێی ئەگوترێ (رَسُول) هەم (نَبیّ).

بەڵام ئەگەر فەرمانی پێنەكرابو بە خەڵكی ڕابگەیەنێ، ئەمە تەنها پێی ئەگوترێ (نَبیّ).

ئینجا لەو هەموانە (٣١٥) بە (رَسُول) ناو ئەبرێن. واتە: نێردراو، چونكە كتێبی تایبەتییان لە لای خوا بۆ هاتوەو فەرمانی ڕاگەیاندنیان پێكراوە.

وَالْيَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ. قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ؟ قَالَ ﷺ: أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ

---

ئینجا لەوانەش پێنجیان زۆر بەڕێزن‌و بە (أُولُوالْعَزْم) ناو ئەبرێن: حەزرەتی (نوح)و (ابراهیم)و (موسی)و (عیسی)و (محمد) ﷺ وعليهم، سەرداری هەموویان حەزرەتی (محمدالمصطفی)یە ﷺ، ئەو پێغەمبەری ئاخیر زەمانە، هیچ پێغەمبەرێك لە دوای ئەو نایێ، بەلاّم نابێ دەمارگیری بمانگرێ، ئەبێ باوەڕمان بە هەموانیان هەبێ: کە پێغەمبەری خودانە. تەنها ئەوەندە هەیە بە یاسای ئیسلام، یاسای ئەوان لەکار کەوتوە، بەلاّم ئەو شەش ڕوکنەی ئیمان هەموو پێغەمبەران وەکو یەکتری بە ئوممەتی‌خۆیان ڕاگەیاندوە، کەوابوو: ئایینی هەموویان هەر یەکە، یاسایان جیایە.

(وَالْيَوْمِ الآخِرِ) پێنجەم ڕوکنی‌ئیمان: باوەڕهێنانە بە ڕۆژی دوایی، کە لە مردنەوە دەست پێ‌ئەکا، ئینجا لە دوای مردن زیندوو ئەکرێنەوە، پاش ئەوەی ئەم دونیایە گشتی تێك ئەدرێ: بە فوو لێ‌کردنی حەزرەتی ئیسرافیل، جارێکی تریش، فوو لە (صور) ئەکاتەوەو هەموو گیانلەبەرێك زیندوو ئەبێتەوەو بەرەو گۆڕەپانی مەحشەر ئەکەونە ڕێ، ئینجا پرسیارو وەلاّممان لێ‌ئەکرێ. دەربارەی کردەوەی دونیا، ئینجا دەفتەری کردەوەمان —کە لە دونیا نووسراوە— دەماندرێتەوە، ئینجا چاکەو خراپە بە تەرازوو ئەکێشرێ: ئەگەر چاکەت گرانتر بوو ئەچیتە بەهەشت، ئەگەر خراپەت گرانتر بوو ئەچیتە جەهەننەم، ئینجا کە دادگای مەحشەر کۆتایی هات لە سەر جەهەننەم پردێك دائەندرێ: ئەبێ هەموو کەس بە سەریدا تێپەڕێ، مرۆڤی چاك ڕزگاری ئەبێ، بەلاّم مرۆڤی خراپ لەوێ ئەکەوێتە خوارەوە بۆ ناو جەهەننەم، خوا بمانپارێزێ.

(وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ) شەشەم ڕوکنی ئیمان ئەوەیە: باوەڕ بهێنی بە قەزاو قەدەر: چاکە، یان خراپە. ئەی موسوڵمان: هەرچی لەم دونیایە ڕووئەدا: لە هەبوونی‌و هەژاری‌و خۆشی‌و مردن‌و کوشتن‌و غەمناکی‌و هەموو بەسەرهاتێکی‌تر، هەمووی بە ویست‌و زانستی خوا نووسراوەو کات‌و شوێن‌و چەندایەتی‌و چۆنیەتی‌ی بۆ داندراوەو بەم جۆرە دێتە جێ. بەلاّم وا تێمەگە: کە ئەوها نووسراوە بە زۆر ئەو ئیشەت پێ‌ئەکەن، بەڵکو خوا توانای چاکەو خراپەی داوەتە تۆ، بە کەیفی خۆتە، ئەگەر توانایەکەت لە چاکە بە کار بێنی، پاداشتت ئەدرێتێ، ئەگەر توانایەکەت لە خراپە بە کار بێنی سزا ئەدرێی.

ئینجا کە پێغەمبەر ﷺ ئەو شەش ڕوکنانەی فەرموون (قَالَ: صَدَقْتَ) پیاوە نەناسراوەکە گوتی: ڕاست ئەکەی. (قَالَ) دیسان پیاوەکە گوتی: (فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ) پێم بڵێ: چاکە چی‌یە؟ (قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (أَنْ تَعْبُدَ اللهَ) چاکە ئەوەیە: خوا بپەرستی (كَأَنَّكَ تَرَاهُ) وەك بە چاو ببینی لە کاتی‌پەرستنی‌دا (فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ) جا ئەگەر نەتتوانی وەها

فَإِنَّهُ يَرَاكَ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ؟ قَالَ ﷺ: مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَاتِهَا؟ قَالَ ﷺ: أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ.

---

بیپەرستی کە ئەتۆ خوا ئەبینی (فَإِنَّهُ يَرَاكَ) وا بیپەرستە کە بێگومان خوا ئەتۆ ئەبینێ. مەبەست ئەوەیە: ئەوەندە بە ترس‌و بە بێ‌گەردی خوا بپەرستی: وەك لە بەرچاوت بێ، یان تەماشات بکا.

**بۆ نموونە:** کرێکارێك لە بەردەم وەستایەك کار بکا، بێگومان کە وەستایەکەی لە بەرچاو بێ باشتر کار ئەکا، هەروەها ئەگەر لە بەر چاویشی نەبێ، بەڵام چاودێری‌ی بکا، دیسان ئیشەکەی هەر بە باشی ئەکا.

**بزانە:** پێغەمبەر ﷺ لە شەوی میعراج بە چاوی‌خۆی خوای‌گەورەی دیتوە. هەروەها: هەموو خاوەن باوەڕێك لە بەهەشتدا بە چاوی‌خۆی خوای‌گەورەی ئەبینێ، خوای‌گەورە ئەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ چەند ڕوخسارێك لە ڕۆژی قیامەت ئەدرەوشێنەوەو تەماشای خوای خۆیان ئەکەن.

(قَالَ) دیسان پیاوەکە گوتی: (فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ) پێم بڵێ: کەینێ دونیا وێران ئەبێ؟ (قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ) ئەوەی پرسیاری لێ‌ئەکرێ زاناتر نیە لەوەی پرسیار ئەکا، چونکە پێنج شتی پەنهان‌و نەزاندراو هەنە تەنها خوا بە خۆی ئەیانزانێ، هەروەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ لەم ئایەتە پیرۆزەدا پێنج شتی پەنهان‌و نەزاندراو هەنە جگە لە خودای گەورە کەس نایانزانێ: **یەکەم:** کاتی دونیا وێرانبوون. **دووەم:** کاتی هاتنی بارانی سودبەخش. **سێیەم:** بەسەرهاتی کۆرپەی ناو منداڵدانە. **چوارەم:** کەس نازانێ بەیانی چی ئەکا. **پێنجەم:** کەس نازانێ لە کوێ ئەمرێ.

(قَالَ) پیاوەکە گوتی (فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَاتِهَا) پێم بڵێ: نیشانەکانی دونیا وێرانبوون چی‌یە؟ (قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا) یەك لە نیشانەکان ئەوەیە: دایك ببێتە خزمەتکاری کیژەکەی خۆی، واتە: ئەوەندە بێ‌ڕێزی بڵاو ئەبێتەوە: کچ جوێن بە دایکی ئەداو فەرمانی بە سەردا ئەکاو خزمەتی‌خۆی پێ‌ئەکا (وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ) نیشانەیەکی‌تر ئەوەیە: دەبینی پێ‌خواسەکان‌و (الْعُرَاةَ) بێ‌بەرگەکان‌و (الْعَالَةَ) هەژارەکان‌و (رِعَاءَ الشَّاءِ) شوانەکان (يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ) هەموویان شانازی لە سەر یەکتری ئەکەن بە بەرزی‌و جوانی کۆشك‌و تەلارەکانیان، **مەبەست ئەوەیە:** ناکەس بەچەو لێنەهاتووەکان کاروباری خەڵکی ئەگرنە دەست‌و پیاوماقوڵان ئەکەونە ژێر دەستی ئەوان.

ثُـــمَّ انْطَلَـــقَ، فَلَبِثْـــتُ مَلِيًّـــا، ثُـــمَّ قَـــالَ ﷺ: يَـــا عُمَـــرُ أَتَـــدْرِي مَـــنِ السَّـــائِلُ؟ قُلْتُ: اَللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ ﷺ: فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ ﴾ رواه مسلم.

---

جـا ئەوانـە تـەنها دوو نیشـانەی بچـووکی دونیـاوێرانبوونن، بـەڵام نیشـانەیتر زۆرن بـە تایبـەتی هـی گـەورە: وەك هـاتنی دەجـال، هاتنـەخوارەوەی عیسـی پێغەمبـەرﷺ، گەڕانەوەی ڕۆژ لە لای ڕۆژئاواوە...هتد.

(ثُمَّ انْطَلَقَ) ئینجا پیاوەکە ڕۆیشت (فَلَبِثْتُ مَلِيًّا) ئیمامی(عومـەر) فـەرمووی: مـاوەی سـێ شـەو مامەوە، پاش ڕۆیشتنی پیاوەکە (ثُمَّ قَـالَ: يَـا عُمَرُ) ئینجـا چـوومەوە خزمـەت پێغەمبـەرﷺو فەرمووی: ئەی عومەر (أَتَدْرِي مَنِ السَّائِلُ؟) ئایا ئەزانی ئەوە کێ بوو پرسیاری لێکردم؟ (قُلْتُ) منیش گوتم (اَللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَـمُ) خـواو پێغەمبـەری خـواﷺ زانـاترنو ئـەزانن، مـن نـازانم (قَـالَ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی (فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ) ئـەوە (جوبرائیـل) بـوو، کـە فریشـتەیەکی خوایـە (أَتَـاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ) هاتبو فێری ئایینیپیرۆزی ئیسلامتان بکا، تا بزانن چۆن پرسیاری ئایینی بکـەن (رواه مسلم) ئەم حەدیسە ئیمامی (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

**جا بزانە:** (٢٤٠٠٠) بیستوچوار هەزار جار حەزرەتی (جوبرائیل) هاتوتە لای پێغەمبەرﷺ.

هەروەها: لەو حەدیسەدا بۆمـان دەرئەکـەوێ: کـە پرسـیاری ئـایینی پێویستە لـە سـەر پیـاوی نەزان، هەروەها: سەحابەی پێغەمبـەرﷺ حـەزرەتی جوبرائیلیـان لـە سـەر شـێوەی ئـادەمیزاد بینیوە، چونکە لە سەر شێوەی فریشتەیی جگە لە پێغەمبەرﷺ هیچ کەس ناتوانێ ببینێ.

### ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ): پـێی ئـەگوترێ ووشـەی یەکخواپەرستی (كَلِمَـةُ التَّوْحِيـدْ) چونکە واتـەی (لاَإِلَهَ): هیچ پەروەردگارێكو هیچ پەرستراوێكو هیچ دادوەرێك نیە (إِلاَّاللهُ): تەنها زاتی (اَللهُ) نەبێ، واتە: هاوبەشی نیە.

٢- (مُحَمَّدٌ رَّسُولُ اللهِ): ووشەی دانهێنانە بە پێغەمبەرایـەتی حـەزرەتی (مُحَمَّدﷺ)، واتـە: باوەڕکردن بە هەر شتێکی ئەو لە لای خوداوە بە ئێمەی ڕاگەیاندوە.

٣- (أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ): باوەڕت هەبێ بە هەبوونی خوا: بە (رُبُوبِيَّة)=پەروەردگاریەتی خوا، بـە (أُلُوهِيَّة)=خوایەتی خـوا، واتـە: هـەر ئـەو خودایە (مَعْبُـود)=پەرسـتراوە، هـەر ئـەو خوایـە (حـاكِمُ)=دادوەرە، کەسـیتر مـاف پەرسـتنو دادڕەوایـی نیـە، خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ للهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَـيِّمُ﴾، واتـە: دادڕەوایـی=(حاكِمِيَّـة) تـەنها مـاف (اَللهُ)یـە، فـەرمانی داوە: جگـە لـە خـۆی هـیچ کەسـیتر نەپەرسـتنو بە دادوەر=(حاکم)ی دانەنێن، ئەم بیروباوەڕە ئایینی ڕاستەقینەیە.

٤- (مَاالْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِـنَ السَّـائِلِ): بەڵگەیـە: کەفاڵچیو هەواڵگۆیـەکانی پـەنهانی گشتیان درۆزنـن، پێغەمبـەرﷺ ئەفـەرموێ: ﴿مَنْ أَتَى عَرَّافاً أَوْ كاهِناً فَصَدَّقَهُ بِما يَقُولُ فَقَـدْ

## (اَلْحَدِيثُ الثَّالث: في أَرْكانِ الإسْلاَم)

﴿ عَنْ أبِي‌عبدالرّحمن عبدالله بن عُمَرَ بن الْخَطّاب رضی الله عنهما، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: بُنِيَ الإسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَّسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ،

---

كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍﷺ﴾ رواهُ أحمد، واتە: هەركەسێك بچێتە لای فاڵچیەك، یان هەواڵگۆیەکی پەنهانی، باوەڕیشی پێکرد، بە ڕاستی ئەوە کوفری کرد بەو قورئانەی بۆ پێغەمبەرﷺ هاتۆتە خوارەوە.

٥- (يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ): پێغەمبەرﷺ هەر کاتێك مامۆستای بۆ شوێنێك ناردبان بۆ بانگەوازی ئیسلامو شەرع فێرکردن، پێی ئەفەرمون: ﴿يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا﴾ رواه الشيخان، لە ئاییندا ڕێگەی سووکترو ئاسان بگرنەبەر-بە مەرجێ لە سنوور دەرنەچێ- ڕێگای سەخت مەگرنە بەر، موژدە بدەنە خەڵك بە بەختەوەری دونیاو قیامەت، ئەم خەڵکە لە ئایین دوور مەخەنەوەو توندو تیژی بە کار مەهێنن.

### ﴿ حەدیسی سێیەم: پێنج ڕوکنەکانی ئیسلام (بناغە) ﴾

(عَنْ أبِي‌عبدالرّحمن عبدالله بن عُمَرَ بنِ الْخَطّاب رضی الله عنهما) گێڕدراوەتەوە لە (عبدالله)ی کوڕی ئیمامی (عومەر) خوا لێیان ڕازی بێ، سەحابەیەو -یەکێکە لەو چوار (عبدالله)یانە، کە پێیان ئەگوترا: (اَلْعَبادِلَةُالأَرْبَعَة). **دووەمیان:** (عبدالله)ی کوڕی (عەباس). **سێیەم:** (عبدالله)ی کوڕی (زوبەیر). **چوارەم:** (عبدالله)ی کوڕی (عەمر)ی کوڕی (عاص)، خوا لێیان ڕازی بێ.- لە (مَكَّة) لە دایك بوو، لەگەڵ باوکی‌دا کۆچی کرد بۆ (مەدینە)، ماوەی شەست ساڵ فتوای داوە، (١٦٣٠) حەدیسی گێڕاوەتەوە، لە تەمەنی (٨٦) ساڵی‌دا لە (مَكَّة) ساڵی (٧٣)ی‌کۆچی، وەفاتی کردوە.

(قَالَ) ئەفەرموێ: (سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ) گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو (يَقُولُ: بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ) ئەیفەرموو: ئایینی ئیسلام دامەزراوە لە سەر پێنج بناغە، پێیان ئەگوترێ: ڕوکن.

**یەکەمیان:** (شَهَادَةِ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ) شادە هێنانە بەو جۆرەی گوتمان لە حەدیسی (٢)مدا، ئەم شادەیە پێویستە کافر بیڵێ کە موسوڵمان ئەبێو ئەگەر موسوڵمانیش کافر بوو: ئەبی دووبارە شادە بێنێ بۆ ئەوەی ئیسلام ببێتەوە.

**دووەم:** (وَإِقَامِ الصَّلاَةِ) نوێژکردنە، چونکە نوێژی تەواو لە کردەوەی خراپ قەدەغەی ئەکا، کەوابوو: مەرجە نوێژەکە: بە دەستنوێژ بێ، جلو بەرگو شوێنی نوێژت پاك بێ، ڕووت لە قیبلە بێ، بێ‌جموجۆڵو پێکەنین بەو گفتوگۆ مەکە، فاتیحەو تەحیات بە پوختیو ڕەوانی بخوێنەو، سوجدەو ڕکوعت تەواو بێ، ئەگەر ئەوها نەبێ نوێژەکەت دروست نیە.

وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ﴾ رواهُ الْبخاري ومُسْلِم.

**سێیەم:** (وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ) زەکات دانە، چونکە بە زەکات دان ئاشتی لە ناو کۆمەڵدا جێگیر ئەبێ، کەوابوو: زەکات بدە بە هەژارو قەرزدارو موجاهیدانی ڕێگای خوداو چەند کەسێکی تر کە لە شەریعەتیئیسلام باسیان کراوە، ئەگەر تا ئێستا زەکاتت نەداوە، ئەبی پەشیمان ببیتەوە لەو تاوانەو زەکاتەکەت هەموو بدەیەوە، چونکە مافی فەقیرە.

**چوارەم:** (وَحَجِّ البَيْتِ) حەج کردنە، ئەمەیان ڕوکنی پێنجەمە، بەڵام لەم ڕیوایەتەدا کراوە بە چوارەم، جا ئەبی حەج کردنت بە ماڵی حەڵاڵ بێ، تەنها بەنیازی خودا بچیتە حەج، ئەبی چوونە ماڵیخودا ببێتە هۆی پەشیمانبوونەوەت لە تاوانەکانت، جا کە لە حەج کردن ئەگەڕێیەوە، وەك منداڵی ساوا بێگوناهی، کەوابوو: دیسان باری خۆت گران مەکە بە گوناە کردن.

**پێنجەم:** (وَصَوْمِ رَمَضَانَ) بەڕۆژووبوونی مانگیڕەمەزانە، ڕۆژووگرتن لە نەخۆشی دوورت ئەخاتەوە، پاداشی زۆرت لە لای خوا بۆ دابین ئەکا، جگە لەمەش کە خۆت برسی بوی، بەزەییت بە هەژارو لێقەوماواندا دێتو ئەزانی هەبوونی چەند خۆشەو نەبوونی چەند ناخۆشە (رواهُ البخاري ومُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (شَهَادَةِ أَنْ لاَّإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًارَّسُولُ اللهِ): هەر کەسێك بە زوبان ئەم شادەیە بێنێو هاوبەش بۆ خوا دانەنێ، نە بە زوبان، نە بە کردەوە کوفر نەکا، ئەوە بە موسوڵمان دائەندرێ، هەروەها ئەگەر شادەی نەهێنا، بەڵام لە نەژادی ئەودا: باوکێکیموسوڵمان، یان دایکێکیموسوڵمان هەبوو، ئەویش بە موسوڵمان دائەندرێ. بڕوانە (شرح مسلم للنواوي).

٢- (وَإِقَامِ الصَّلاَةِ): نوێژ لە شەوی (میعراج) واجب کراوە، ڕوکنیدووەمی ئیسلامە، کەوابوو: هەرکەسێك نوێژێك، یان زیاتر لە نوێژێکی نەکرد، واجبە قەزای بکاتەوە، هیچ جیاوازی نیە، ئەم نوێژەی بە قەسدیو تەمبەڵی نەکردبێ، یان بە هۆی نوستن، یان بە هۆی خەریکبوون بە کارێکیتر نەیکردبێ ﴿عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّهُ شُغِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ صَلاَةِ الْعَصْرِ يَوْمَ الأَحْزَابِ، ثُمَّ صَلاَّها بَيْنَ الْعِشائَيْنِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی (خندق) ماوەیان نەدایێ نوێژی عەسر بکا، ئینجا لە نێوان مەغریبو عیشادا نوێژەکەی کرد.

٣- (وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ): زەکات ڕوکنیسێیەمی ئیسلامە لە ساڵی (٢)ی کۆچی واجب کراوە، کەوابوو: ئەگەر کەسێك زەکاتی لە سەر واجب بوو و نەیدا، ئەبی تۆبە بکاو زەکاتەکەش هەر بدا، جا ئەگەر هاتو نەیداو مرد، واجبە میراتگرەکان پێش دابەشکردنی میرات زەکاتەکە دەربکەن وەك قەرزەکانیتری ئادەمیزاد، ئەگینا: میراتەکەیان لێحەڕامە،

## ( اَلْحَدِيثُ الرّابِع: فِي مَراحِل خَلْق الإنْسان )

﴿ عَنْ أَبِي‌عَبْدالرَّحْمَن عَبْدالله بن مَسْعُودﷺ قالَ: حَدَّثَنا رَسُولُ اللهِﷺ وَهُوَ الصّادِقُ الْمَصْدُوق: إنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا-نُطْفَةً-، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْل ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْل ذَلِكَ،

---

هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿دَيْنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى﴾ رواهُ الشيخان، واتە: قەرزی خوا لەپێشترە کە بدرێتەوە.

٤- (وَصَوْمِ رَمَضَانَ): ڕۆژووی ڕەمەزان لە ساڵی (٢)ی کۆچی‌دا واجب کراوە، ڕوکنی چوارەمی ئیسلامە کەوابوو: هەرکەسێك ڕۆژووی نەگرتبو، ئەبی قەزایان بکاتەوە، ئەگەر قەزای نەکردەوەو مرد، دروستە خزمێکی‌خۆی، یان کەسێکی‌تر بە ئیزنی‌خزمەکەی بۆی قەزا بکاتەوە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيامٌ، صامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ﴾ رواهُ الشيخان، هەرکەسێك ڕۆژووی لە سەر بونو مرد، با خزمەکەی لە جیاتی وی بە ڕۆژوو ببێ.

٥- (وَحَجِّ الْبَيْتِ): حەج پێنجەمین ڕوکنی ئیسلامە، لە ساڵی (٦)ی کۆچی‌دا واجب کراوە، کەوابوو: هەرکەسێك حەجی لە سەر بوو و نەیکردو مرد، واجبە لە میراتەکەی حەجی بۆ بکرێ، پێغەمبەرﷺ بە پیاوێکی فەرموو: ﴿أُحْجُجْ عَنْ أَبِيكَ﴾ رواهُ النسائي، لەجیاتی باوکە مردووەکەت حەج بکە.

## ﴿ حەدیسی چوارەم: قۆناغەکانی دروستبوونی ئادەمیزاد ﴾

(عَنْ أَبِي‌عَبْدالرَّحْمَن عَبْدالله بن مَسْعُودﷺ) گێڕدراوەتەوە لە (عبدالله)ی کوڕی مەسعود، خوا لێی ڕازی بێ، ئەم (عبدالله)یەش سەحابەیە، شەشەمین کەس بوو کە لە (مەککە)ی پیرۆز موسوڵمان بووە، کۆچی کرد بۆ مەدینە، هەر لەوێ لە ساڵی (٣٢)ی کۆچی وەفاتی کردوە، تەمەنی لە شەست ساڵ زیاتر بوو، لە لای پێغەمبەرﷺ، زۆر خۆشەویست بوو، لە خزمەتیا ئەڕۆیشتو لە کاتی‌دانیشتنیا کەوشەکانی بۆ هەڵئەگرتن، (٨٤٨) حەدیسی گێڕاونەوە.

(قَالَ) عبدالله ی کوڕی مەسعود ئەفەرموێ: (حَدَّثَنا رَسُولُ اللهِﷺ) پێغەمبەرﷺ بۆ ئێمەی فەرموو (وَهُوَ الصَّادِقُ) پێغەمبەرﷺ ڕاستگۆیە لە فەرموودەکانی‌خۆی، هەم (الْمَصْدُوقُ) باوەڕ پێکراوە لەو فەرموودانەی لە لای خوا بۆی دێن:

(إنَّ أَحَدَكُمْ) هەر یەکێك لە ئێوە (يُجْمَعُ خَلْقُهُ) خوا دروستی ئەکاو کۆی ئەکاتەوە (فِي بَطْنِ أُمِّهِ) لە ناو زگی دایکی‌خۆی‌دا (أَرْبَعِينَ يَوْمًا نُطْفَةً) بە ماوەی چل ڕۆژ -کە کرمی ئاوی پیاوەکە تێکەڵ بە هێلکۆکەی ئافرەت ئەبێ- بە شێوەی (مَنِي) ئەمێنێتەوە.

(ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ) ئینجا دەبێتە پارچە خوێنێکی مەیی بۆ ماوەی چل ڕۆژی‌تر

(ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ) ئینجا دەبێتە پارچە گۆشتێك بۆ ماوەی چل ڕۆژی‌تر.

ثُمَّ يُرْسَلُ إِلَيْهِ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فيه الرُّوحَ، وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: يَكْتُبُ رِزْقَهُ، وَأَجَلَهُ، وَعَمَلَهُ، وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، فَوَاللهِ الَّذِى لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ، إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا ﴾

---

(ثُمَّ يُرْسَلُ إِلَيْهِ الْمَلَكُ) ئینجا خوا فریشتەیەکی تایبەتی ئەنێرێ بۆ منداڵدانە (فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ) گیان دێنێتە بەر کۆرپەکە.

**بزانە:** لە دوای چل و دوو ڕۆژ نەخشی ئاشکرای منداڵ دەست پێ ئەکرێ و لە دوای (١٢٠) ڕۆژ گیانی دێتە بەر و نەخشی تەواو ئەبێ.

(وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ) هەر لەم کاتەش خوای گەورە فەرمان ئەداتە فریشتەکە بە نووسینی چوار ووشە لە نێوچاوانی کۆرپەکە:

**یەکەم:** (يَكْتُبُ رِزْقَهُ) کەم و زۆری ڕزقی چەندەو چۆنە؟ **دووەم:** (وَأَجَلَهُ) تەمەنی چەندە؟. **سێیەم:** (وَعَمَلَهُ) کردەوەی باشە، یان خراپە؟. **چوارەم:** (وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ) ئایا لە ڕۆژی دوایی‌دا بەدبەختە یان بەختەوەرە.

﴿**ئاگاداری**﴾ دەرمان خواردن بۆ فڕێدانی کۆرپەی ناو زگ لە دوای چل و دوو ڕۆژ حەرامە، بەڵام ئەگەر نەخشی تەواو بوو، یان گەیشتە سەدو بیست ڕۆژ، ئەوە زیاتر حەرامەو ئەبێتە کوشتنی بە ناهەق و ئەبێ تۆڵەی بداو کەففارەتیش بدا، واتە: کۆیلەیەک ئازاد بکا، ئەگەر نەبو: ئەبێ دوو مانگ لە سەر یەکدا بە ڕۆژوو بێ. هەروەها: دەرمان خواردن بۆ نەبوونی منداڵ بە یەکجاری حەرامە، بەڵام بۆ ماوەیەک بە پێی پێویستی دروستە.

(فَوَاللهِ الَّذِى لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سوێندم بە خودای تاک و تەنیا (إِنَّ أَحَدَكُمْ) هی وا هەیە لە ئێوە (لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ) کارو ڕەفتاری وەک کردەوەی دانیشتووانی بەهەشت وایە (حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ) تا وەها لە بەهەشت نزیک ئەبێتەوە ئەوەندەی نامێنێ بچێتە ناو بەهەشت (فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ) نووسراوەکەی ناو زگی دایکی پێشی لێ ئەگرێ (فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ) لە دوایی‌دا دەست ئەکا بە کارو ڕەفتاری دۆزەخیانە (فَيَدْخُلُهَا) ئەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ. کەوابوو: بە زۆری خواپەرستی خۆت لە خۆ بایی مەبە.

(وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ) هی واش هەیە: کردەوەی وەک دانیشتووانی دۆزەخ وایە (حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ) تا وەها لە ئاگر نزیک ئەبێتەوە ئەوەندەی نامێنێ بچێتە ناو دۆزەخ (فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ) نووسراوەکەی ناو زگی دایکی پێشی لێ ئەگرێ (فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ) لە دوایی‌دا دەست بە کردەوەی بەهەشتیانە دەکا (فَيَدْخُلُهَا)

ئەچێتە بەهەشت (رواهُ البخاری ومُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە، بەڵام لەم دووانەدا وشەی (نُطْفَة) نیە، بەڵكو لە ڕیوایەتی (أبوعوانة)دا هەیە.

جا وا دیارە: هی وەهاش هەیە لە یەكەم ڕۆژدا تا مردنی هەر كردەوەی بەهەشتیانە ئەكاو بە پێچەوانەش هەیە، لە بەر ئەوە هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: بەدبەختیو دوارۆژی خراپ بۆ كەسێكە: بەردەوام بێ لە سەر كردەوەی خراپ، ئەگەر كەسێك بەردەوام بێ لە سەر كردەوەی باشو بەردەوام نەبێ لە سەر خراپە، ئەمە دوارۆژی باش ئەبێ.

**بە هەر جۆرێك:** قەزاو قەدەر نهێنییەكی تایبەتە بە خوا، پەردەی لە سەر ئەو نهێنییە لانەداوە بۆ هیچ كەس، كەوابوو: باوەڕی پێ بهێنەو زیاتر لێی مەكۆڵەوە، چونكە شەیتان پێت ئەڵێ: ئەگەر چارەنووسی تۆ بۆ بەهەشت، یان جەهەننەم بێ، ماندووبوونت بۆ چییە؟ خوا بپەرستی، یان نەیپەرستی هەر دەچیتە ئەو شوێنەی بۆت دانراوە. بەڵام پێویستە تۆ زۆر هۆشیار بیو بە قسەی شەیتان فریو نەخۆی، هەردەم كردەوەی چاكە بكە، ئەگەر تا ئێستا خراپەت كردوە پەشیمان ببەوەو دەست بە چاكە بكە.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿**هەموو كەس شوێنی بۆ دانراوە لە بەهەشت، یان لە جەهەننەم**). پیاوێك پرسی –یا رَسُولَ اللهﷺ– كەوابوو: بۆ پاڵ نەدەینەوەو واز نەهێنین؟ لە وەڵامدا فەرمووی: (**ئێوە دەست بە كار بن، هەركەسە ئەو ڕێگایەی بۆ ئاسان ئەكرێ كە بۆی دروست كراوە)**﴾.

**ئینجا بزانە:** بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیا ببی: كە چاكەو خراپە دراوەتە دەست مرۆڤ، ئەم حەدیسە ئەخەینە بەرچاوت: ﴿عَنْ عیاضرضي الله عنه: قالَ النَّبيﷺ فیما یَرْویه عَنِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: إنِّی خَلَقْتُ عِبَادِی حُنَفاءَ كُلَّهُمْ، وَإنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّیاطِینُ فَاجْتالَتْهُم عَنْ دِینِهِمْ﴾ رواهُ مُسْلِم، واتە: خوای گەورە ئەفەرموێ: من بەندەكانی خۆم لە سەر دڵێكی پاكو ئیسلام وەرگر دروست كردون، گومڕایان هاتنە لایانو لە ئایین لایاندان، واتە: بە هۆی شوێنكەوتنی ئەوان گومڕا بون.

### ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١– (یُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِینَ یَوْمًا): **بزانە:** ئەم حەدیسە باسی قۆناغەكانی گۆڕانی كۆرپەی ناو زگ دەكا، چونكە دروستكردنی كۆرپە، هەر لە چل ڕۆژەكەی یەكەمدا تەواو ئەبێ، بەم شێوەیە:

هەر كاتێك ئاوی پیاو چووە ناو مندالدانەی ئافرەت، بە لای كەمی پێویستی بە شەش سەعات هەیە تا كرمی ناو ئاویپیاوەكە تێكەڵی هێلكۆكەیئافرەتەكە ئەبێ، ئینجا كە تێكەڵ بوو، لە دوای حەفت ڕۆژ دروستكردنی دەست پێئەكرێو دەرئەكەوێ ئافرەتەكە

ئاوسه، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ تَعالَى إِذَا أَرادَ خَلْقَ عَبْد فَجامَعَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ طَارَ ماؤُهُ فِي كُلِّ عِرْقٍ وَعُضْوٍ مِنْهَا، فَإِذا كانَ الْيَوْمُ السَّابِعُ جَمَعَهُ اللهُ تَعالَى، ثُمَّ أَحْضَرَهُ كُلَّ عِرْقٍ لَهُ دُونَ آدَمَ، فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شاءَ رَكَّبَهُ﴾ رواه الطبراني وابن منده، هەر کاتێك خوای گەورە ویستی بەندەیەك دروست بكا، پیاوەكەش لەگەڵ ئافرەتەكەدا جیماعی كرد، تامی ئاوی پیاوەكە ئەپرژێتە گشت دەمارو ئەندامەكانی ئافرەتەكە، ئینجا لە ڕۆژی حەفتەمدا خوای گەورە كۆی ئەكاتەوەو گشت دەمارەكانی بۆ ئامادە ئەكا: لە نێوان خۆیو باب ئادەم، لە هەر وێنەیەكدا خوا حەز بكا دروستی دەكا.

واتە: لە ڕۆژی حەفتەمدا-لەو دەمارانە- دەمارێك بۆ خۆی ڕای ئەكێشێو شێوەی خاوەنیدەمارەكە وەرئەگرێو وێیدەچێ.

ئینجا بەرە بەرە ئەم دەمارە پەنهانانە خوێنی ئافرەتەكە هەڵئەمژن، تا لە ڕۆژی پانزەمدا ئەبێتە خوێن، ئینجا لە دوای نۆ ڕۆژیتر ئەبێتە گۆشتو نەخشی پەنهانی دڵو ئەندامەكانیتری دەست پێئەكا، ئینجا بە تەواوبوونی چلو دوو شەو نەخشی ئاشكرای ئەندامەكانی دەست پێئەكرێ، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِذا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتانِ وَأَرْبَعُونَ لَيْلَةً بَعَثَ اللهُ إِلَيْهَا مَلَكاً فَصَوَّرَهَا: وَخَلَقَ سَمْعَهَا وَبَصَرَهَا وَجِلْدَهَا وَلَحْمَهَا وَعِظَامَهَا﴾ رواهُ مُسْلِم، هەر كاتێك چلو دوو شەو بە سەر تۆوی پیاودا ڕۆیشت لە ناو منداڵدانەدا، خوای گەورە فریشتەیەكی بۆ ئەنێرێ نەخشی ئەكا: گوێو چاو و پێستەو گۆشتو ئێسقانی دروست ئەكا.

**ئینجا بزانە:** لەم سێ قۆناغەدا: كۆرپە ژیانی هەیە، بەڵام تا (١٢٠) ڕۆژ تەواو نەبێ: گیانی نایەتە ناو لاشەكەیو ناجوڵێ، ئینجا پێویستە: كۆرپە لە ناو زگیدایكیدا بە لای كەمی شەش مانگ تەواو بكا، ئینجا بێتە دەرەوە، تاكو بژیێ.

دەربارەی ئەم قۆناغانە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾ خوای گەورە دروستتان ئەكا لە ناو زگی دایكتاندا، قۆناغ بە قۆناغ لە ناو سێ تاریكیدا، واتە: تاریكی پەردەیزگ، پەردەیمنداڵدانە، پەردەی پزدان=وڵاش -كە بە دوای منداڵبووندا دێتە دەرەوە-﴿فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾.

٢- (فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ): **بزانە:** منداڵی لەبارچوو، ئەگەر لە كاتی هاتنە دەرەوە گیانی تێدا بوو، واجبە بشۆرێو كفن بكرێو نوێژی مردووی لە سەر بكرێو بنێژرێ، بەڵام ئەگەر گیانی تێدا نەبو، واتە: بە مردوویی هاتە دەرەوە، ئەوە تەنها نوێژی لە سەر ناكرێ، سێیەكانیتر واجبن، هەروەها ئەگەر پارچە خوێن بوو، یان پارچە گۆشت بوو، بەڵام نەخشی ئاشكرای دیار نەبو: سوننەتە لە ناو پەڕۆیەكدا بپێچرێو ژێر خاك بكرێ.

**جا بزانە:** ئەگەر منداڵ بە زیندوویی نەیەتە دەرەوە: نە میرات ئەگرێ، نەمیراتی لێئەگیرێ.

## ( اَلْحَديثُ الْخامس: في تَرْكِ الْبِدْعَة )

﴿ عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنينَ أُمِّ عَبْدِاللهِ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، وَفِي رِوايَةٍ لِمُسْلِم: ﴿ مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ ﴾.

---

## ﴿ حەدیسی پێنجەم: نەکردنی بیدعە ﴾

(عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنينَ أُمِّ عَبْدِاللهِ عَائِشَةَ رضي الله عنها) گێڕدراوەتەوە لە دایکیئیمانداران کە ناوی (عائشە)یە، کیژی حەزرەتی (ئەبوبەکر)ی صدیق بوو-خوا لێیان ڕازی بێ- بۆیێ پێی ئەگوترێ: دایکیئیمانداران. چونکە خێزانی پێغەمبەرﷺ بوو، لە (مەککە) لە دایك بووە، هەر لەوێ لە تەمەنی شەشساڵیدا باوکی لە پێغەمبەریﷺ مارە کردوە، ئینجا کۆچی کردوە بۆ (مەدینە)، لە ساڵی دووی کۆچی کە تەمەنی بووە نۆ ساڵ گواستراوە بۆ پێغەمبەرﷺ، هیچ منداڵی نەبوە، لە دوای پێغەمبەرﷺ چل ساڵ ژیاوە، لە (مەدینە) کۆچی دوایی کردوە، (١٢١٠) حەدیسی گێڕاونەوە.

(قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ) ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی (مَنْ أَحْدَثَ) هەرکەسێك لەخۆیەوە زیادەیەك پەیدا بکا (فِي أَمْرِنَا هَذَا) لە کاروباری ئێمە: کە ئایینیئیسلامە (مَا لَيْسَ مِنْهُ) ئەو شتە زیادە بەڵگەی وەهای نەبێ، کە پەیوەندی بە ئایینەوە هەبێ (فَهُوَ رَدٌّ) ئەوە لێی وەرناگیرێو ئەدرێتەوە بە سەریا، هەم سزاش ئەدرێ، کەوابوو: هەر شتێکیئایینی کە دەکرێ: بە فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ نەبێو لە سەر بناغەی قورئانو حەدیس نەبێ، ئەوە خوا وەریناگرێ (رواهُ البخاري ومُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

(وَفِي رِوايَةٍ لِمُسْلِم) لە ڕێگەیەکیتری (موسلیم) بەم جۆرەیە: فەرموویەتی (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ) هەرکەسێك کردەوەیەکیئایینی بکا کە بە فەرمانی ئێمە نەبێ، ئەوە لێی وەرناگیرێو ئەدرێتەوە بە سەریا.

**بۆ نموونە:** ئەگەر لە کاتێکیتایبەتیدا نوێژێك بکەی کە لە شەرعدا نەبێ، یان هەر جۆرە خوا پەرستیەکیتر بکەی لە شەرعدا نەبێ، یان شێوەی خواپەرستی بگۆڕی بۆ شێوەیەکیتر، یان کەمی بکەی، یان زیادی بکەی، ئەوە هیچیت لێوەرناگیرێو لە لایخوا بە تاوانبار دائەندرێی، بەڵام ئەو شتە زیادەیە لە ئاییندا: ئەگەر بە ڕێگەیەکیشەرعی بوو: ئەمە باشەو خوا وەریئەگرێ، هەروەك لە حەدیسی (٢٨)دا باسی ئەکەین-إن شاء الله- کە ڕوونکەرەوەی ئەم حەدیسەیە.

**ئینجا بزانە:** پێغەمبەرﷺ ئێمەی ئاگادار کردۆتەوە کە بە هۆی کام ڕێباز تووشی گومڕایی ئەبینو لە ئایینیئیسلام دوور ئەکەوینەوە، بەم فەرموودە شیرینە: ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه:

عَنِ النَّبيﷺ قَالَ: لَتَتَّبِعُنَّ سُنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ شِبْرًا بِشِبْرٍ ذِرَاعًا بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرِ ضَبٍّ لاَتَّبَعْتُمُوهُمْ. قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ آلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: فَمَنْ؟﴾ رواهُ الشيخان، واته: ئێوه به شوێن ڕەوشتی ئەوانەی پێشە خۆتان ئەکەون‌و ڕێبازی ئەوان ئەگرنە بەر، بست به بست‌و گەز به گەز، ئەگەر ئەوان بچنە ناو کونی سوسە مار، ئێوەش به شوێنیاندا ئەچن، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، مەبەستت ئەوەیە: کە ئێمە شوێن جولەکەو دیانەکان=فەلە ئەکەوین؟ فەرمووی: ئەدی کەسی‌تر هەیە؟ واتە: مەبەستم ئەوانە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا، مَا لَيْسَ مِنْهُ): ئیمامی(الشافعی)ﷺ ئەفەرموێ: (**مَا أُحْدِثَ وَخَالَفَ كِتَاباً أَوْ سُنَّةً أَوْ إجْماعاً أَوْ أثَراً، فَهُوَ الْبِدْعَةُ الضَّالَّةُ، وَمَا أُحْدِثَ مِنَ الْخَيْرِ وَلَمْ يُخَالِفْ شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ فَهُوَ الْبِدْعَةُ الْمَحْمُودَةُ**)، هەر شتێك لە ئاییندا پەیدا بکرێ‌و دژایەتی‌ی لەگەڵ قورئان، یان حەدیس، یان ئیجماع، یان فەرموودەیەکی سەحابەکان هەبێ، ئەوە (بدعة)ی گومڕا (قَبِيحَة)یە، وە هەر کارێکی چاکە پەیدا بکرێ‌و دژایەتی لەگەڵ ئەم چوارانە نەبێ، ئەوە (بدعة)ی باشە (حَسَنَة)یە.

هەروەها ئیمامی (النواوی)ش لە (تهذیب الأسماء واللغاة)دا ئەفەرموێ: (الْبِدْعَةُ الْحَسَنَةُ) هەیە، (الْبِدْعَةُ الْقَبِيحَةُ)ش هەیە. واتە: هەر شتێك لە دوای چەرخی پێغەمبەرﷺو سەحابە پەیدا بکرێ، یەکێکە لەم دوو (بدعة) یە.

٢- (لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا): مەبەست فەرمانی خواو پێغەمبەرەﷺ، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍﷺ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ﴾ رواهُ مُسْلِم، باشترین فەرموودە: قورئانی پیرۆزە، باشترین ڕێگە: ڕێبازی پێغەمبەرەﷺ، خراپترین کار: پەیداکراوەکانن لە ئایین، گشت کارێکی‌پەیداکراو بیدعەیە، گشت بیدعەیەکیش گومڕابوونە. کەواتە: مەبەست بە (بدعة) ئەوەیە: لە سەردەمی پێغەمبەرﷺو سەحابەکانی‌دا نەبوبێ.

٣- (كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ) بە ڕستەی (لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا) ئەبەسترێتەوە، تاکو بتوانین بڵێین: چاپکردنی قورئان هەرچەند (بدعة)یە-چونکە تازە پەیدا کراوە- بەڵام (بِدْعَة حسنَة)یە چونکە کارێکی چاکەو ئەچێتە ژێر فەرمانی پێغەمبەرﷺ کە ئەفەرموێ: ﴿بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً﴾ رواهُ البخاري، لە جیاتی من بگەیێننە ئوممەتم هەرچەند یەك ئایەتیش بێ.

کەوابوو: بە گوێرەی فەرموودەی ئیمامی(الشافعیﷺ) ڕستەی (كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ) تەنها ئەو جۆرە کردەوانە ئەگرێتەوە: کە هیچ سەرچاوەیەکی نەبێ لەم چوار سەرچاوانەی

﴿ عَنْ أَبِيعبدالله النُّعْمَان بن بَشِير رضي الله عنهما: قَـالَ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللهِﷺ يَقُـولُ: إِنَّ الْحَلاَلَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ،

---

باسی كردون: وەكو جگەرە كێشان، ڕیش تاشین، ڕەنگكردنی مزگەوتەكان، گومبەت دروستكردن لە سەر گۆڕەكان...هتد، ئەمانە گشتی (بِدْعَة قَبِيحَة)نەو زۆر زۆر جیاوازن لەگەڵ چاپكردنی قورئان؟!.

## ﴿ حەدیسی شەشەم: حەڕامو حەڵاڵو خۆپاراستن لە حەڕام ﴾

(عَنِ أَبِيعبدِالله النُّعْمَانِ بن بَشِيرٍ رضي الله عنهما) گێڕدراوەتەوە لە (نوعمان)ی كوڕی (بەشیر)خوا لێیان ڕازی بێ.خۆیو باوكی سەحابەنە، لە ساڵی(٢)ی كۆچی-یەكەم منداڵی(أَنْصاري) بوو كە لە دوای هاتنیپێغەمبەرﷺ بۆ مەدینە-لە دایك بووە، تەمەنی (٨) ساڵان بوو كە پێغەمبەرﷺ وەفاتی كرد، (١١٤) حەدیسی گێڕاوەتەوە، لە ساڵی (٦٤)ی كۆچی وەفاتی كردوە.

(قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ) ئەفەرموێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو.

**بزانە:** لە كاتی منداڵیدا ئەم فەرموودەی گوێ لێبووە، كەوابوو: پێویستە منداڵان دەرسی فەرموودەی پێغەمبەریان پێبگوترێ (يَقُولُ) پێغەمبەرﷺ ئەیفەرموو: (إِنَّ الْحَلاَلَ بَيِّنٌ) حەڵاڵ ئاشكرایە: هەرچی خواو پێغەمبەرﷺ فەرموویتیان حەڵاڵە. یان بێدەنگییان لێكردبێ، ئەوە حەڵاڵە (وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ) هەروەها حەڕام ئاشكرایە: هەرچی خواو پێغەمبەرﷺ فەرموویتیان حەڕامە. ئەوە حەڕامە.

**بزانە:** یەكدەنگی سەحابەی پێغەمبەرﷺ، یان زانایانی ئایینیئیسلام لە سەر حەڵاڵی، یان حەڕامی شتێك، وەك فەرموودەی خواو پێغەمبەرﷺ ڕەفتاری پێئەكرێ، ئەم جۆرە یەكدەنگییە پێی ئەگوترێ (إِجْماع)، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَجْمَعُ أُمَّتِي عَلَى ضَلاَلَةٍ﴾ رواهُ الترمذي، واتە: خوای گەورە زانایانی ئوممەتم بە تێكڕایی لە سەر هیچ گومڕابوونێك كۆناكاتەوە.

(وَبَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ) وە لە نێوان حەڵاڵو حەڕامدا چەند شتێكی وێكچوویی هەنە: وەك حەڕام وایە، وەك حەڵاڵ وایە (لاَ يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاس) ئەم جۆرە شتانە زۆر كەس نایانزانێ، چونكە لایەنی حەڕامییان ئاشكرا نیە، لایەنی حەڵاڵیشیان ئاشكرا نیە؟ لە بەر ئەوەی دوو فەرموودەی دژ بە یەك لەو بابەتە هەیەو لێیان تێناگا دژایەتی لاببا، یان زانایان بە دوو جۆری دژ بە یەكتر ئەو فەرموودانەیان ڕوون كردۆتەوە، یان دوو جۆرە (فتوا)ی دژ بە یەكتر دراوە: یەكێكیان ئەڵێ حەڕامە. یەكێكیان ئەڵێ: حەڵاڵە. جا لە بەر ئەمە پێ ئەچێ حەڵاڵ بێو پێش ئەچێ حەڕام بێ، كەوابوو: ئەبێتە شبوهات.

فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ فَقَدْ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَـرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلاَ وَإِنَّ لِكُـلِّ مَلِـكٍ حِمًـى، أَلاَ وَإِنَّ حِمَىاللهِ مَحَارِمُهُ، أَلاَ وَإِنَّ فِيالْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذَا فَسَـدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم.

---

(فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ) جـا هەرکەسێك واز لـە شـوبوهات بێنـێو خـۆی بپـارێزێ لـەو شـتەی گومانی حەڕامی تێدا هەیە (فَقَدْ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ) بە ڕاستی ئـەو کەسـە پاکانـەی بـۆ ئـایینی خۆی کرد (وَعِرْضِهِ) هەروەها پاکانەی بۆ ئابڕووی خۆی کرد.

کەوابوو: ئەی موسوڵمان، ئەگەر دوو دڵ بووی لە شتێکا: ئایا حەڕامـە، یـان حەڵاڵـە، وەك خواردنو کڕینی ماڵی کەسێك کـە مـاڵی حـەڕامی هەیـە، ئـەوە هەرچـەند خـواردنو کـڕینی دروسـتـە، بـەڵام ئـەتۆ وازی لێبێنـەو ماڵەکـە مـەکڕەو مـەیخۆ، بـەم وازهێنانـە ئایینەکـەت ئەپارێزیو ئابڕووەکەشت ئەپارێزیو کەس بە خراپە باست ناکا.

(وَمَنْ وَقَعَ فِيالشُّبُهَاتِ) هەرکەسێك بکەوێتە ناو شوبوهاتو بڵێ: چونکە بـە ئاشـکرایی حـەڕام نیە وازی لێناهێنم (وَقَعَ فِيالْحَرَامِ) ئەو کەسە نزیکە بکەوێتە ناو حەڕام (كَالرَّاعِي) ئەو کەسەی ئەکەوێتـە نـاو شـوبوهات وەك شـوانێك وایـە (يَرْعَـى) مـەڕ بلـەوەڕێنێ (حَـوْلَ الْحِمَـى) لە دەورەی پاوانێك، واتە: لەوەڕگەی قەدەغەکراو (يُوشِكُ) زۆر نزیکە (أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ) ئەو مەڕە بکەوێتە پاوانەکەو بیخوا، شوانەکەش سزا ئەدرێ، بڕوانە حەدیسی (١١)و(٢٧).

واتە: ئـەو کەسـەی گـوێ ناداتـە شـتی گومـان لێکـراو، وەك ئـەو مـەڕە مەترسـی لێئـەکرێ تووشی حەڕام ببێ، بە هۆی گوێ مەدییخۆیو بە سووك زانینی شوبهە.

(أَلاَ) ئاگادار بن: (وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى) هەموو کاربەدەستێك شتێکی پاوانکراوی هەیـەو سـنووری بۆ داناوە، هەرکەس سنووری بشکێنێ سزای ئەدا (أَلاَ وَإِنَّ حِمَىاللهِ) ئاگادار بـن: پـاوانکراویخوا (مَحَارِمُهُ) ئەو شـتانەیە کـە حـەڕامی کـردوو سـنووری بـۆ دانـاوە، هـەر کـەس سـنووری خـوا بشکێنێ سزای ئەدا، ئینجا ئەو کەسەی خۆی لە شوبوهات ناپارێزێ با بزانێ: لە سـنووری خـوا نزیك کەتۆتەوەو مەترسی لێئەکرێ سنووری بشکێنێو بکەوێتە ناو حەڕام.

(أَلاَ وَإِنَّ فِيالْجَسَدِ مُضْغَةً) ئاگـادار بـن: لـە نـاو لاشـەی ئـادەمیزادا پـارچـە گۆشـتێك هەیـە (إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ) ئەگەر ئەم پارچە گۆشتە باش بوو و بۆ خـوا گونجـا، هـەموو لاشەو ئەندامانی ئادەمیزاد باش ئەبێو بـۆ خـوا ئـەگونجێ (وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّـهُ) ئەگەر خراپ بوو و لەگەڵ خودا ناڕێك بوو، هەموو لاشەو ئەندامی ئـادەمیزاد خـراپو ناڕێـك ئەبێ (أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ) ئاگادار بن: ئەم پارچە گۆشتە دڵی ئادەمیزادە (رواهُ البخاری ومُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

لـەم فەرمووده‌یـە بـۆت دەركـەوت: دڵ سـەركرده‌ی هـەموو ئەنـدامی ئـادەمیزادە، ئەگـەر سەركرده پیاوی چاك بێ، سەربازەكانیش باش ئەبن، كەوابوو: هەركەسێك دڵـی لەگـەڵ خـوا ڕاست بێ، هەموو كارو كردەوەكانی باش ئـەبێو خـۆی دوور ئـەگرێ لـە حـەڕامو شـوبوهاتو هەموو فەرمانێكیخوا جێبەجێ ئەكا، بەڵام ئەگەر دڵی لەگـەڵ خـوا نارێـك بـوو، كردەوەشـی نارێك ئەبێو گوێ بە حەڕام ناداو لە خوا ناترسێو فەرمانیخوا جێبەجێ ناكا.

ئەم فەرمووده‌یە بەڵگەیـە بـۆ دەمكوتكردنـەوەی ئـەو كەسـانەی ئـەڵێن: ئێمـە دڵمـان پـاكو بێگەردەو نوێژكردنو خواپەرستی مەرج نیە. بەڵام ئەمە ڕاست نیـە، هـەروەك لـەم حەدیسـە پیرۆزەدا بۆمان ڕوون بۆوە: كە بیروباوەڕی تەواو بە خواو بە پێغەمبەرﷺ ئەوەیە لە ناو دڵدا جێگیر بێو كردەوەی باشیش بەڵگەیە لە سەر ئیمانی تەواو، چونكە كاتێك مرۆڤ گوناه ئـەكا، دڵی ڕەش ئەبێ، جا ئەگەر پەشیمان بۆوە، دڵی پاك ئەبێتەوە، ئەگەر بەردەوام بـێ لـە سـەر خراپەو گوناه، ئەوە دڵی هەر ڕەش ئەبێو مەترسـی بێبـاوەڕی لێئـەكرێ، چـونكە هـەر لـە پشكە بارانەكان لافاو هەڵئەستێو دونیا وێران ئەكا.

كەوابوو: بەردەوام هەوڵ بدە بـۆ پاككردنـەوەی دڵـت: بـە خواپەرسـتیو پەشیمانبوونەوە لە گوناه، بە وازهێنان لە حەڕامو شوبوهات.

**ئینجـا بزانـە:** ئەگـەر كردەوەكانیشـت بـاش بـێ، بـەڵام بـۆ خـوا نـەبێ، خـوای گـەورە وەرینـاگرێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ إِنَّ اللهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَلَكِـنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ﴾ رواهُ مُسْلِم، واتـە: خـوای گـەورە تەماشـای وێنـەی ڕوخسـارو ماڵتان ناكا، بەڵام تەماشای ناو دڵو كردەوەكانتان دەكا: ئایا بۆ خوایە یان بۆ دونیایە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (فَمَنْ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ فَقَدْ اسْتَبْرَأَ لدينه): **بزانـە:** (تَقْوَى)، واتـە: لـە خواترسـان، ئەوەیـە: خوای گەورە لەو شوێنانە نەتبینێ: كە لێی قەدەغە كردوی، لەو شوێنانە گومت نـەكا: كـە فەرمانی پێكردووی. كەوابوو: دووركەوتنەوە لـە (شُبُهات) بەشـێكی (تَقْوى)یـە، هـەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ يَبْلُغُ الْعَبْدُ أَنْ يَكُونَ مِنَ الْمُتَّقِينَ حَتَّى يَدَعَ مَالاَ بَأْسَ بِهِ حَذَراً مِمَّا بِهِ الْبَأْسُ﴾ رواهُ الترمذی، واتە: بەندە ناگاتە پلەی لە خواترسان، تـا واز لـە شـتی بێگومـان دێنێ لە ترسی شتی گومانلێكراو. بڕوانە حەدیس (١٨).

٢- (وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَـرَامِ): **بزانـە:** كەوتنـە نـاو شـتی گومـانلێكراو، هـەر لە خۆیدا تاوانە، كەوابوو: بە سـووكی تەماشـای گومـانلێكراو و گونـاهی بچـووك مەكـەو زۆر لێیان بترسە، چونكە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِيَّاكُمْ وَمُحَقِّرَاتِ الذُّنُوبِ، فَـإِنَّهُنَّ يَجْـتَمِعْنَ

## ( اَلْحَديثُ السّابع: فى النَّصيحَة )

﴿ عَنْ أَبىِ رُقَيَّةَ تَميم بن أَوْسِ الدّارىﷺ: أَنَّ النَّبيﷺ: قالَ: اَلدِّينُ النَّصيحَةُ. قُلْنا: لِمَنْ؟ قالَ: للّه عَزَّ وَجَلَّ وَلِكتابه وَلِرَسُوله وَلأَئمَّة الْمُسْلمينَ وَعَامَّتِهِمْ ﴾ رواهُ مُسْلم.

---

عَلَى الرَّجُلِ حَتَّى يُهْلِكْنَهُ﴾ رواهُ الإمام أحمد، واته: ئاگاداری خۆتـان بـن لـه گوناهـه سـوکه‌کان، بێگومان ئه‌م گوناهه سوکانه له سه‌ر مرۆڤ کۆ ئه‌بنه‌وه، تا ماڵوێرانی ئه‌که‌ن.

٣- (إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ): چه‌ند که‌سێك هه‌یه: فریویـان خـواردوه‌و ئـه‌ڵێن: ده‌ی ده‌ی خـوا زۆر بـه ڕه‌حمـه، ئه‌گـه‌ر چاکه‌شمان نـه‌بێ هـه‌ر لێمـان خـۆش ئـه‌بێ، چـونکه بیروباوه‌ڕمان به خوا زۆر به هێزه. به‌ڵام ئایا ئه‌مه ڕاسته؟! ﴿عَنْ أَنَسٍﷺ عَنِ النَّبِـيﷺ: لَيْسَ الإِيمانُ بالتَّمَنِّي وَلاَ بالتَّحَلِّي، وَلَكنْ هُوَ مَا وَقَرَ فِي الْقَلْبِ وَصَدَّقَهُ الْعَمَلُ﴾ رواهُ ابـن النّجار والـديلمي، ئیمـان بـه خۆزگـه‌یی‌و گفتوگـۆی جـوان نیـه، بـه‌ڵکو ئیمـانی تـه‌واو ئه‌وه‌یـه له ناو دڵدا جێگیر بێ‌و کرده‌وه‌ی چاکیش شاهیدی ئه‌م ئیمانه بێ.

### ﴿ حه‌دیسی حه‌فته‌م: ئامۆژگاری ﴾

(عَنْ أَبِي رُقَيَّةَ تَمِيم بنِ أَوْسِ الدَّارِيﷺ) گێڕدراوه‌ته‌وه له (ته‌میم)ی (الدّاری). ئـه‌م بـه‌ڕێزه له پێشدا دیـان بـوو، لـه سـاڵی (٩)ی کۆچـی لـه خزمـه‌ت پێغه‌مبـه‌رﷺ موسـوڵمان بـووه، له ساڵی (٤٠)ی کۆچی له فه‌له‌ستین وه‌فاتی کردوه، (١٨) حه‌دیسی گێڕاونه‌وه.

ئه‌فـه‌رموێ: (أَنَّ النَّبِـيﷺ: قـالَ) پێغه‌مبـه‌رﷺ فـه‌رمووی: (اَلـدِّينُ النَّصِـيحَةُ) کۆڵه‌گـه‌ی ئایینی‌ئیسلام بریتی‌یه له ئامۆژگاری‌و دڵسۆزی.

**ئامۆژگاری** ئه‌وه‌یه: به‌رژه‌وه‌ندی که‌سێکت بوێ‌و ڕای خۆتی به دڵسۆزانه‌و بـه بێ‌گـه‌ردی بـۆ بڵێی. (قُلْنا: لِمَنْ؟) ئێمه‌ش گوتمان: ئامۆژگاری بۆ کێ؟ (قالَ لِلّـه عَـزَّ وَجَـلَّ) پێغه‌مبـه‌رﷺ فه‌رمووی: ئامۆژگاری دڵسۆزی‌یه بۆ خوای‌گه‌وره: که خۆشترت بوێ له هه‌موو شتێك، بـاوه‌ڕت پێ‌ی هه‌بێ‌و له فه‌رمانی ده‌رنه‌چی‌و به ته‌واوی بیپه‌رستی.

(وَلِكِتابِهِ) ئامۆژگاری‌یـه بـۆ قورئـانی پـیرۆز: بـاوه‌ڕت پـێ‌ی هـه‌بێ‌و بیخـوێنی‌و بـه خـه‌ڵکی ڕابگه‌یه‌نی‌و ڕوونی بکه‌یه‌وه.

(وَلِرَسُولهِﷺ) ئامۆژگاری‌و دڵسۆزی‌یه بۆ پێغه‌مبه‌ری خواﷺ، خۆشت بوێ‌و بـاوه‌ڕت پـێ‌ی هه‌بێ‌و له فه‌رمانی ده‌رنه‌چی.

(وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ) ئامۆژگاری‌و دڵسۆزی‌یه بـۆ پێشـه‌وایانی موسـوڵمان: دژایه‌تییان نه‌کـه‌ی ئه‌گه‌ر له سنووری ئیسلام ده‌رنه‌چن، فه‌رمانی ئه‌وان جێ‌به‌جێ بکـه‌ی ئه‌گـه‌ر تـاوان نـه‌بێ، زوبانت باش بێ به‌رامبه‌ر ئه‌وان (وَعَامَّتِهِمْ) ئامۆژگاری‌و دڵسۆزی‌یه بۆ هـه‌موو موسـوڵمانان: ڕێگای چاکیان پێ بڵێی، له خراپه قه‌ده‌غه‌یان بکه‌ی، زیانیـان لـه سـه‌ر لابده‌ی، سـودیان پێ‌بگه‌یه‌نی (رواهُ مُسْلِم) ئیمامی (موسلیم) گێڕاویه‌تیه‌وه.

## ( الْحَدِيثُ الثّامن: اَللّٰهُ يَتوَلّى السَّرائِرَ )

﴿ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لآإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَّسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّى دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ تَعَالَى ﴾ رواهُ البخارى ومُسْلِم.

---

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (اَلدِّينُ اَلنَّصِيحَةُ): ئامۆژگارى واجبێكىئايينىيە وەكو نوێژو زەكاتو...هتد ﴿عَنْ جَرِيرٍ رضي الله عنه قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ﴾ رواهُ الشيخان، واتە: پەیمانم لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەست: لە سەر نوێژ كردنو زەكات دانو ئامۆژگاریكردنی گشت موسوڵمانێك.

٢- (وَلأَئِمَّةِالْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ): پێویستە ئامۆژگاری خەڵك بە گفتوگۆی نەرمو لە جێ بێ، تاكو سودی هەبێ (**قالَ بَعْضُ السَّلَفِ: مَنْ وَعَظَ أَخَاهُ سِرّاً فَهِيَ نَصِيحَةٌ، وَمَنْ وَعَظَهُ عَلَى رُؤُوسِ النَّاسِ فَإِنَّما وَبَّخَهُ**)، واتە: هەر كەسێك بە نهێنی ئامۆژگاری برای خۆی بكا، ئەمە بە ڕاستی ئامۆژگارییە، وە هەر كەسێك لە بەرچاوی خەڵك ئامۆژگاریی بكا، ئەمە بە ڕاستی ڕووشكێنو سەرشۆڕی كردوە.

پێشینەی كورد گوتویانە: (**مار بە گۆتەی خۆش لە كونەكەی دێتە دەرەوە**).

## ﴿ حەدیسی هەشتەم: نهێنی ناو دڵ لە سەر خودایە ﴾

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما) گێردراوەتەوە لە (ابْنِ عُمَرَ) خوا لێیان ڕازی بێ (أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ) فەرمانم پێكراوە: لەگەڵ كافران جەنگ بكەم (حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لآإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ) تا شایەدی ئەدەن: جگە لە (الله) هیچ خودایەك نیە، وە (محمدﷺ) نێردراوی خوایە (وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ) وە تا ئەو پێنج نوێژانە بە ڕێكوپێكی دەكەن (وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ) وە تا زەكات ئەدەن بە تەواوی.

(فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ) جا كاتێك شادەو ئیمانیان هێناو نوێژیان كردو زەكاتیان دا (عَصَمُوا مِنِّى) ئەپارێزن لە من (دِمَاءَهُمْ) خوێنیان (وَأَمْوَالَهُمْ)ماڵیان، چونكە بونەتە برای ئێمەی موسوڵمان، واتە: خوێنو ماڵو ناموسیان قەدەغەیە دەستی لێبدرێ (إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ) مەگەر بە مافێكی شەرعیئیسلامی پاراستنی نەمێنێ: وەك كەسێك بكوژێ دەكوژرێتەوە، یان لە ئیسلامەتی پەشیمان ببێتەوە دەكوژرێ، یان زیان لە كەسێك بدا ئەبی تۆڵەی بداتێ (وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ تَعَالَى) ئێمە لە دونیا ئەوها ڕەفتاری لەگەڵ دەكەین، لێپرسینی نیازی ناو دڵی لە سەر خودایە لە ڕۆژی دواییدا (رواهُ البخارى ومُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

..................

لەم فەرموودەیە بۆمان دەرئەكەوێ: نوێژ نەكەرو زەكات نـەدەر ئەگـەر تۆبـە نەكـەن ئـەبی بكوژرێن، بەڵام ڕۆژوونەگر ناكوژرێو ئەخرێتە بەندیخانـە تـا مـانگی ڕەمـەزان كۆتـایی دێ، خواردنو خواردنەوەشی بە ڕۆژ لێقەدەغە ئەكرێ، هەروەها ئەوەی حـەج نـەكا لـە دونیـادا سزا نادرێ، هەروەها لێكۆڵینەوەی ناو دڵی خەڵك لە سەر ئێمە نیەو لە سەر خودایە.

**ئینجا بزانە:** بۆ ئێمە دروست نیە خۆمان تێكەڵی ناو دڵیخەڵكی بكەین، هەركەسێك لـە بـەر چاوی ئێمە موسوڵمان بێ، ئێمەش ئەڵێین: موسوڵمانە ﴿عَن أنسٍ رضي الله عنه: عَن النَّبــيِّ ﷺ: مَــنْ صَلَّى صَلاَتَنَا وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا فَذَلِكَ الْمُسْلِمُ الَّذى لَهُ ذِمَّةُ اللهِ وَذِمَّةُ رَسُــولِه﴾ رواهُ البخاري، واتە: هەركەسێك ئەم پێنج نوێژە بكا، ڕوو لە قیبلەی ئێمـە بكـا، دەسـتكوژی ئێمـە بخوا، ئەوە موسوڵمانەو پەیمانی خواو پێغەمبەری پێدراوە: كە خوێنو ماڵی بپارێزرێ.

﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (حَتَّى يَشْهَدُوا...إلخ): **بزانـە:** بـە تـەنها شـادەهێنان مـرۆڤ ئەبێتـە موسـوڵمان، ئەگـەر بە كردەوە، یان بە زوبان كوفر نـەكا نابـێ بكـوژرێ، كـەوابوو: كوشـتنی نوێژنەكـەرو زەكـات نەدەر، بە هۆی تاوانەكەیە، نەك بە ناوی كوفر، چونكە پێغەمبـەر ﷺ ئەفـەرموێ: ﴿مِنْ أَصْلِ الإِيمَانِ: اَلْكَفُّ عَمَّنْ قَالَ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ، وَلاَ نُكَفِّرُهُ بِذَنْبٍ، وَلاَ نُخْرِجُهُ مِنَ الإِسْــلاَمِ بِعَمَــلٍ﴾ رواهُ أبوداود، واتە: یەكێك لە بنچینەكانی ئیمان: وازهێنانە لەو كەسەی شـادەی هێنـاوە، بـە هـیچ گوناهێك كافری نەكەینو بە هیچ كردەوەیەك لە جوغزی ئیسلام دەری نەكەین.

٢- (وَيُقِيمُوا الصَّــلاَةَ): زانایانیئیسـلام لـە سەردەمیسـەحابەوە تـا ئێسـتا یەكـدەنگن: لە سەر ئەوەی: هەر كەسێك باوەڕی بە واجببوونی نوێژ نـەبێ، ئـەوە كـافرە. واتـە: داوای ئیسلامبوونەوەی لێئەكرێ، ئەگەر موسوڵمان نەبۆوە، ئەكوژرێو نوێژی لە سەر ناكرێو لـە گۆڕسـتانی موسـوڵمانان نانێـژرێ، بـەڵام ئەگـەر بـاوەڕی بـە واجببـوونی نوێـژ هـەبوو و لە بەر تەمبەڵی نەیئـەكرد، ئـەوە كـافر نیـە، بـەڵكو داوای نوێـژكردنی لێئـەكرێ جا ئەگـەر نوێژی نەكرد، گەورەی موسوڵمانان ئەیكوژێ.

٣- (وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ): زەكـات نـەدەر ئەگـەر بـاوەڕی بـە واجببـوونی زەكـات نـەبو ئـەویش كـافرە، بـەو جـۆرەی باسمـان كـرد ڕەفتـاری لەگـەڵ ئـەكرێ، بـەڵام ئەگـەر بـاوەڕی بە واجببوونی زەكات هەبوو، لە بەر بەخیلی نەیئـەدا، ئـەوە گـەورەی موسـوڵمانان بـە زۆر لێی وەرئەگرێ، جا ئەگـەر نەیداو جـەنگی كـرد، ئـەوە جـەنگی لەگـەڵ ئـەكرێ، هـەروەكو ئیمامی (أبوبكر رضي الله عنه) جەنگی لەگەڵ كردن.

**بەڵگـە:** لە سەر كوشتنی نوێژنەكـەرو زەكـات نـەدەر-جگـە لـەم حەدیسـە- خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ﴾ ئەگـەر لـە كوفرەكـەیان

## ( الْحَديثُ التّاسعُ: فعْلِ الْمأْمُورات وَتَرْك الْمنْهيّات )

﴿ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَبْدالرَّحْمَنِ بن صَخْرٍ رضي الله عنه، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ، وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَأْتُوا مِنْهُ مَااسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ وَاخْتِلاَفُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ ﴾ رواهُ الْبُخاري ومُسْلِم.

---

تۆبەیان کردو نوێژیان کردو زەکاتیان دا، وازیان لێبێنن واتە: ئەگەر نوێژیان نەکردو زەکاتیان نەدا بیانکوژن.

٤- (إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ): ئەو مافانەی ئیسلام کە ڕێگای کوشتنی موسولمان ئەدەن: وەکو زینای پیاوێک، یان ئافرەتێک کە جیماعێکی حەلالی کردبێ، یان وەکو مرۆڤێک یەکێکی‌تری بە ناهەق کوشتبێ، یان مرۆڤێك لە دین وەرگەڕابێ، یان ئەو کەسانەی مان ئەگرن لە ئەنجامدانی شەریعەتی‌ئیسلام، کە پێیان ئەگوترێ: (اَلْمُمْتَنِعُونَ مِنَ الشَّرائِعِ)، واتە: ئەو کەسانەی بە کۆمەڵ بڕیار ئەدەن: لە سەر نەکردنی واجبێك، یان لە سەر کردنی حەرامێك ئەوانەش وەکو زەکات نەدەرەکان جەنگیان لەگەڵ ئەکرێ، تا ملکەچی شەریعەتی ئیسلام ئەبن.

**﴿حەدیسی نۆیەم: بەجێهێنانی فەرمانی پێغەمبەرو ﷺ وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان﴾**

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَبْدِالرَّحْمَنِ بنِ صَخْرٍ رضي الله عنه:) گێڕدراوەتەوە لە (ئەبوهورەیرە)خوا لێی ڕازی بێ، سەحابەیە، لە ساڵی (٦)ی کۆچی موسوڵمان بووە، لە تەمەنی (٧٨) ساڵیدا لە ساڵی (٥٧)ی کۆچی لە (مەدینە) وەفاتی کردوە، لە هەموو سەحابەکان زۆرتر حەدیسی لەبەر بون (٥٣٧٤) حەدیسی گێڕاونەوە.

(قَالَ) ئەفەرموێ: (سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ:) گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو ئەیفەرموو: (مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ) هەرچی لە ئێوەم قەدەغە کرد، واتە: فەرمووی مەیکەن (فَاجْتَنِبُوهُ) خۆتانی لێبپارێزن‌و بە هیچ جۆرێك مەیکەن (وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ) وە هەرچی فەرمانی کردنم پێدان، واتە: فەرمووی بیکەن (فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ) هەرچەندی لە تواناتاندا هەیە بیکەن.

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت: کە وازهێنان لە خراپە، زیاتر بایەخی پێ‌ئەدرێ لە کردنی چاکە، چونکە بە هیچ جۆرێك خراپە پەسەند نەکراوەو نابێ بکرێ.

(فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ) نەتەوەکانی پێش ئێوە لە بەر ئەوە خوا لە ناوی بردن (كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ) چونکە بە بێ‌پێویست پرسیاری زۆر بێ‌سودیان لە پێغەمبەران ئەکرد (وَاخْتِلاَفُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ) هەروەها دژ بە فەرمانی پێغەمبەرانی‌خۆیان ئەجولانەوە (رواهُ البخاري ومُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

لێرەدا مەبەست پرسیارکردنی بێ کەڵکە، چونکە پرسیارکردنی کاروباری ئایینی پێویستە لە سەر هەموو موسوڵمانێك.

**هــەروەها بزانــە:** ئەگــەر ئێمــەش دژ بــە فــەرمانی پێغەمبــەریخۆمانﷺ بجولێینــەوە لەناوچوونمان نێزیکە، کەوابوو: بە هیچ جۆرێك سنووری خواو پێغەمبەرﷺ مەشکێنە.

**ئینجــا بزانــە:** هەرکەسێك لــە فــەرمانی پێغەمبــەرﷺ دەرچــێ: نیشــانەی ئەوەیــە کــە پێغەمبــەریﷺ خــۆش نــاوێ، وە هەرکەسێك پێغەمبــەری خــۆش نــەوێ نیشــانەی کــەم باوەڕییە، وە ئەگەر بە پێغەمبەری نەزانی ئەمە کــافرە ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قــالَ: لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ والِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ رواهُ الشيخان، واتــە: باوەڕی هیچتان تەواو نیە، تاکو منی لە دایك باوكو منداڵەکانی خۆیو لــە گشــت خــەڵکیتر خۆشتر ئەوێ.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ): دەقی ئەم فەرموودەیە وا ئەگەیەنێ: کە واجبە لە هەموو جۆرە قەدەغەکراوێك خۆمان بپارێزین، جا کەم بێ، یان زۆر بێ، هەرچەند بەرژەوەندی گشتی، یان تایبەتیش تێك بچێ.

ئینجا هەر لە سەر بناغەی ئەم فەرموودەیە، قاعیدەیەکی (أُصُولُ الفِقْه)ی بنیــات نــراوە، کــە ئەڵێ: (دَرْءُ الْمَفاسِدِ أَوْلَى مِنْ جَلْبِ الْمَصالِحِ) واتە: لادانو لابردنی خراپەکان لەپێشترە لە وەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکان.

کەوابوو: خواردنەوەو کڕینو فرۆشتنی شەڕاب حەرامەو واجبە قەدەغە بکرێ؟ چونکە زیان لە عەقڵو دین ئەدا، هەرچەند بەرژەوەندی شەڕابخانەو شەڕابفرۆشەکانیش تێك بچێ.

٢- (وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ): دەقی ئەم فەرموودەیە وا ئەگەیەنێ: کــە واجبــە بــە گــوێرەی توانــا فــەرمانپێکراوەکان بکــەین، هــەروەك خــوای گــەورە ئەفــەرموێ: ﴿فَــاتَّقُوا اللهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ واتە: تا تواناتان هەیە لە خوا بترسن.

ئینجا هەر لە سەر بناغەی ئەم ئایەتو حەدیسە، قاعیدەیەکی (أُصُولُ الفِقْه)ی بنیــات نــراوە، کە ئەڵێ: ( ما لاَ يُدْرَكُ كُلُّهُ، لاَ يُتْرَكُ جُلُّهُ ) واتە: هەر شتێك ناگونجێ هەمووی بکرێ، واز لــە کردنی بەشە زۆرەکەی ناهێندرێ.

کەوابوو: ئەگەر کەسێك تەنها بەشی ڕووخساری ئاوی دەست کــەوت، ئــەبی بــە کــاری بێنــی، ئینجا تەیەمموم بکا. هەروەها ئەگەر ئاو و گڵیشی دەست نەکــەوت: واجبــە بــە بێدەســتنوێژی نوێژەکە هەر بکا، جا کاتێك ئاوی دەست کەوت قەزای بکاتەوە.

٣- (فَــاجْتَنِبُوهُ...مَاسْــتَطَعْتُمْ): دەقــی ئــەم دوو فەرموودەیــە وا ئەگەیــەنن: قەدەغــەکراو بە هیچ جۆرێك نابێ بکرێ، بەڵام فەرمانپێکراو بەگوێرەی توانایە، کەوابوو: ئەگەر هۆیــەکی ڕەوا هەبوو، دروستە، یان واجبە: فەرمانپێکراو نەکرێ.

## ( الْحَديثُ الْعاشر: في اكْتساب الْحَلاَل )

﴿ عَنْ أَبي هُرَيْرَةَرضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: إِنَّ اللهَ طَيِّبٌ لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّبَاً، وَإِنَّ اللهَ أَمَرَ الْمُؤْمنينَ بِمَا أَمَرَ بِه الْمُرْسَلِينَ،

---

ئینجا هەر بە بەڵگەی ئەم حەدیسەو لە سەر بناغەی (قاعدە)یڕابردوو-( دَرْءُ الْمَفاسِدِ أَوْلَى مِنْ جَلْبِ الْمَصالِحِ )- واجبە: موسوڵمان واز لە فەرمانپێکراو بێنێ ئەگەر بە هۆی کردنی فەرمانپێکراوەکە مەترسی ڕوودانی قەدەغەکراوێك هەبوو:

**بۆ نموونە:** ﴿عَنْ عائشَةَ رضي الله عنها: قالَ النَّبيﷺ: لَوْلاَ حداثَةُ عَهْدِ قَوْمِك بِالْكُفْرِ لَنَقَضْتُ الْكَعْبَةَ وَلَجَعَلْتُها عَلَى أَساسِ إِبْراهيمَﷺ﴾ رواهُ الشيخان، واتە: پێغەمبەرﷺ بە (عائشَة)ی فەرمووی: ئەگەر گەلەکەی تۆ-دانیشتووانی مەککە- تازە موسوڵمان نەبوبان، (كَعبَة)م هەڵئەوەشاندو لە سەر بناغەکەی (ابراهیم)مﷺ دروست ئەکردەوە.

واتە: لێرەدا پێغەمبەرﷺ وازی لەم (سُنَّة)ی ابراهیم پێغەمبەرﷺ هێنا، لە ترسی ڕوودانی قەدەغەکراوێك: کە پەرتەوازەو دڵشکانی دانیشتووانی (مكة)یە، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿أَنْ أَقيمُواالدِّينَ وَلاَ تَتَفَرَّقُوا فيهِ﴾ ئەم ئایینە ئەنجام بدەنو پەرتەوازەیی تێدا مەکەن. کەوابوو: ئەی لاوی موسوڵمان-قوربانت بم- نەکەی بە هۆی (سُنَّة)یێکی فەرمانپێکراو، بچی پەرتەوازەیەكو ململانەیەکی قەدەغەکراو بکەی.

٤- (إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَثْرَةُ مَسَائلِهِمْ): پرسیارکردنی بێسود، یان پێنەویست: یەکێکە لەو کارە نارێکانەی قەدەغە کراوە لە سەر موسوڵمان، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ تعالَى حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الأُمَّهاتِ وَمَنْعاً وَهاتِ وَوَأْدَ الْبَناتِ، وَكَرِهَ لَكُمْ قيلَ وَقالَ وَكَثْرَةَ السُّؤالِ وَإِضاعَةَ الْمالِ﴾ رواهُ الشيخان، واتە: خوای گەورە لە ئێوەی حەڕام کردوە: ئازاردانی دایکان، حەڕامی کردوە: نەدانی ئەو مافەی لە سەرەتانەو داوا کردنی ئەو شتەی مافی ئێوەی تێدا نیە، حەڕامی کردوە: زیندەبەچاڵ کردنی کیژەکان، خوا پێی ناخۆشە: گۆتە گۆت بکەن-واتە: هەرچی گوێتان لێبو بیلێنەوە- پێی ناخۆشە: زۆر پرسیاری پێنەویست بکەن، پێی ناخۆشە: ماڵ بە فیڕۆ بدەن.

### ﴿ حەدیسی دەیەم: هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی حەلاڵ ﴾

(عَنْ أَبي هُرَيْرَةَرضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ) لە (ئەبوهوڕەیرە) گێڕدراوەتەوە، ئەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إِنَّ اللهَ طَيِّبٌ) خوای گەورە پاكو بێعەیبەو (لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّبَاً) تەنها شتی حەلاڵو بێگەرد نەبێ وەرناگرێ، کەوابوو: هەر شتێك کە بەخۆت ئەیخۆیو بە کاری ئەهێنی، یان بۆ ماڵو منداڵت بە کاری ئەهێنیو ئەیخۆن، یان لە ڕێگای خوا ئەیبەخشی، ئەبی حەلاڵ بێو تەنها هەر بە نیازی خوا بێ، ئەگینا: پاداشتت بۆ نانوسرێ.

(وَإِنَّ اللهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ) خوای گەورە فەرمانی داوەتە خاوەن باوەڕان (بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ)

فقَالَ تعالَى: (يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا). وَقَالَ تعالَى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ). ثُمَّ ذَكَرَﷺ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ يَا رَبِّ يَا رَبِّ. وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ!﴾ رواهُ مُسْلِم.

---

بەو جۆرە فەرمانەی داویەتیە پێغەمبەران صَلَّى اللهُ عَلَيْهِمْ أَجْمَعِين (فَقَالَ تَعالَى) خوای گەورە لە فەرمانی بۆ پێغەمبەران، ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ﴾ ئەی پێغەمبەرانی من ﴿كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ شتی پاكو حەلاڵ بخۆنو بە كاری بێنن ﴿وَاعْمَلُوا صَالِحًا﴾ كردەوەی باش بكەن. (وَقَالَ تَعالَى) هەر بەو جۆرە خوای گەورە فەرمان ئەداتە ئیمانداران‌و ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی خاوەن باوەڕان ﴿كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ لەو حەلاڵە بێگەردە بخۆنو بە كار بێنن، كە داومانە بە ئێوە.

كەوابوو: بەكارهێنانی حەڕام بە هیچ جۆرێك دروست نیە، جا ئەگەر تا ئێستا ماڵی خەڵكت خواردوە، تۆبە بكەو تۆڵەی ماڵەكە بدەوە دەست خاوەنەكەی، یان دەست میراتگرەكانی ئەگەر بە خۆی نەمابو، بەڵام ئەگەر خاوەنی ناناسیتەوە، یان دەستت ناكەوێو خزمیشی نیە، بیدە بە دوو پیاوماقوڵی چاك، بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی بكەن.

(ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ) ئینجا پێغەمبەرﷺ باسی جۆرە پیاوێكی كرد (يُطِيلُ السَّفَرَ) كە سەفەری دوورو درێژ ئەكا: بۆ حەج كردن‌و سەردانی خزمان‌و خواپەرستیی‌تر (أَشْعَثَ) مووی سەری ناڕێك ئەبێو (أَغْبَرَ) تۆزاوی ئەبێ چونكە لە ماڵ نیە خۆی بشوا (يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ) دەستی خۆی بەرز ئەكاتەوە بۆ ئاسمان‌و لە خوا ئەپاڕێتەوەو ئەڵێ: (يَا رَبِّ يَا رَبِّ) خوایە لەمە ڕزگارم بكە، خوایە ئەم شتەم بدێ (وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ) لەگەڵ ئەوەشدا خواردنی ئەم ڕێبوارە حەڕامە (وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ) خواردنەوەی حەڕامە (وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ)جل‌و بەرگو كەل‌و پەلی ناو ماڵی حەڕامە (وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ) هەر بە حەڕام پێگەیەندراوەو گەورە بووە (فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ؟) چۆن ئەم جۆرە كەسە دوعای قبوڵ ئەبێ؟ واتە: قبوڵ نابێ (رواهُ مُسْلِم) ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

**ئینجا بزانە:** دوعاكردن ئەوەیە: لە خوا بپاڕێیتەوە شتێكت بۆ بكا، یان بەڵایەكت لە سەر لابدا: لە دونیا، یان لە قیامەت. دوعاكردن باشەو خوا پێی خۆشە داوای هەموو شتی لێبكەی، بە مەرجێ ئەو شتەی داوای لێئەكەی ناڕێك نەبێو تاوان نەبێو زیانی خەڵكی تێدا نەبێو هەر لە خوای داوا بكەی، چونكە جگە لە خودا كەسی‌تر دەسەڵاتی نیە.

هەروەها ئەبی خواردن‌و خواردنەوەو جل‌و بەرگو كەل‌و پەلی ناو ماڵت هەمووی حەلاڵ بێ، تاكو قبوڵ ببێ، هەروەها: لە دوعاكردن ئەبی ئاگادار بی: چی ئەڵێی؟ دڵنیا بی كە

خوا بۆت جێبەجێ ئەکا، ئینجا دوعا لە دوای نوێژکردنو بە دەست بەرزکردنەوەو لە سەر ئەژنۆ دانیشتنو ڕوو لە قیبلەو بە تایبەت لە دوای نیوە شەودا باشتر قبولْ ئەبێ، ئەگەر قبولْ نەبو بزانە مەرجەکانی نەهاتۆتە جێ، بەلاّم لە ڕۆژی دوایی پاداشی دوعایەکەی ئەدرێتەوە.

**جا بزانە:** باشترین خواردەمەنیو جلو بەرگ ئەمەیە: کە بە دەستی خۆت بە شێوەیەکی حەلالْ وەدەستی بێنی ﴿عَنِ الْمِقْدامِ ﷺ: أَنَّ النَّبيﷺ: قالَ: ما أَكَلَ أَحَدٌ طَعاماً قَطُّ خَيْراً مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِه، وَإِنَّ نَبِيَّ اللهِ داوُدَ عليه السلام كانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِه﴾ رواهُ البخاري، واتە: هیچ کەسێك خواردەمەنیەکی باشتر ناخوا، لەو خواردنەی کە بە دەستی خۆی پەیدای کردوە، بێگومان پێغەمبەرداود عليه السلام بە دەستیخۆی ئاسنگری ئەکردو خۆی پێ‌ئەژیاند.

﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّبًا): وا ئەگەیەنێ: پێویستە خێرکردن تەنها لە ڕێگای خوا بێو بە شتی حەلالْ بێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَا تَصَدَّقَ أَحَدٌ بِصَدَقَة مِنْ طَيِّب-وَلاَ يَقْبَلُ اللهُ إِلاَّ الطَّيِّبَ- إِلاَّ أَخَذَهَا الرَّحْمَنُ بِيَمِينه، وَإِنْ كَانَتْ تَمْرَةً فَتَرْبُو فِي كَفِّ الرَّحْمَنِ حَتَّى تَكُونَ أَعْظَمَ مِنَ الْجَبَلِ﴾ رواهُ الشيخان، هەرکەسێك خێرێك بە مالّی حەلالْ بکا -چونکە خوای گەورە حەلالْ نەبێ وەریناگرێ- خوای گەورە ئەم خێرە بە ڕاستەی خۆی وەرئەگرێو قبولّی ئەکا، هەرچەند دانە قەسپێکیش بێ، لە لای خوا زیاد ئەکا تا لە چیا گەورەتر ئەبێ.

٢- (كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ): وا ئەگەیەنێ هەولْدان بۆ وەدەستهێنانی حەلالْ واجبەو خۆ نەپاراستن لە حەڕام نیشانەی بەدبەختی‌یە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ التُّجَّارَ يُبْعَثُونَ يَوْمَ الْقِيامَةِ فُجَّاراً، إِلاَّ مَنِ اتَّقَى اللهَ وَبَرَّ وَصَدَقَ﴾ رواهُ الترمذي، واتە: بازرگانەکانی درۆزنو فێلّباز لەگەلْ ستەمکاران زیندوو ئەکرێنەوەو حەشر ئەکرێن، تەنها بازرگانێك نەبێ: کە لە خوا ترسابێو حەڕامی وەرنەگرتبێو چاکەی کردبێو ڕاستی‌ی گوتبێ.

٣- (يُطِيلُ السَّفَرَ): إلى آخر الحديث، **بزانە:** دوعاکردن چەند ئادابو پێویستیەکی‌تری هەیە تاکو قبولْ ببێ، بۆ نموونە: پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَحْمِيدِ اللهِ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ، ثُمَّ لْيُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّﷺ ثُمَّ لْيَدْعُ بَعْدُ بِماشاءَ﴾ رواهُ أصحاب السنن، واتە: هەر یەکێکتان نوێژی کردو ویستی دوعا بکا، با لە پێشدا سوپاسی خوا بکاو بڵێ: (اَلْحَمْدُ لله). ئینجا سەلاوات لە سەر پێغەمبەرﷺ لێبداو بڵێ: (وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ). ئینجا لە پاش ئەمانە کام دوعای پێخۆشە با بیکا.

## (اَلْحَدِيثُ الْحادِيعَشَر: فِي الْوَرْعِ)

﴿عَنْ أَبِيمُحَمّد الْحَسَنِ بن عَلِيّ بن أَبِيطالب رَضِىَ اللهُ عَنهما: سبْط رَسُول اللهﷺ وَرَيْحانَتـه قالَ: حَفظْـتُ مِـنْ رَسُـول اللهﷺ: (دَعْ مَـا يَرِيبُـكَ إِلَـى مَـا لاَ يَرِيبُـكَ)﴾ رواهُ الترمذي والنّسائِي، وقالَ الترمذي: حديث حسن صحيح.

---

### ﴿حەدیسی یازدەهەم: وازهێنان لە گومانلێكراو﴾

(عَنْ أَبِيمحمدِ الْحَسَنِ بنِ عَلِيّ بنِ أَبِيطالبِ رَضِىَ اللهُ عَنهما) گێڕدراوەتەوە لە حەزرەتی (حەسەن) كوڕی ئیمامی (عەلی) خوا لێیان ڕازی بێ، سەحابەیەو دایكی ناوی (فاطمة)یە كچی پێغەمبەرەﷺ، بۆیە پێی ئەڵێن: (سِبْطِ رسول اللهﷺ) نەوەی پێغەمبەرﷺ، لە ساڵی (٣)ی كۆچی لە دایك بووە، لە ساڵی (٥٠)ی كۆچی لە لای ژنەكەی خۆی ژەهری دەرخوارد دراو وەفاتی كرد، لە مەدینە لە گۆڕستانی (بەقیع) نێژراوە، (١٣) حەدیسی گێڕاونەوە، لە لای پێغەمبەرﷺ زۆر خۆشەویست بوو، لە بەر ئەوە پێی ئەگوترێ: (وَرَيْحانَته) ڕەیحانە بۆنخۆشەكەی پێغەمبەرﷺ.

(قالَ: حَفظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهﷺ) ئەڵێ: ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەرﷺ وەرگرتووەو لەبەرم كردوە، كە ئەفەرموێ: (دَعْ مَا يَرِيبُكَ) واز بێنە لەو شتەی دەتخاتە گومانو گومانت لێی هەیە: ئایا حەڵاڵە، یان نا؟ جا هەرچەند ئەو شتە زۆر كەمو بێنرخیش بێ ﴿عَنْ أَنسرَضِيَ اللهُ عَنهُ: أَنَّ النَّبِيﷺ: مَرَّ بِتَمْرَة فِي الطَّرِيقِ فَقالَ: لَوْلاَ أَنِّي أَخافُ أَنْ تَكُونَ مِنَ الصَّدَقَة لأَكَلْتُهـا﴾ رواهُ الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە ڕێگەدا یەك دانە قەسپی دۆزیەوە، ئینجا فەرمووی: ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایە، كە هی زەكاتە: ئێستا ئەمخوارد، واتە: لە بەر ئەم گومانە وازی لێهێناو نەیخوارد.

(إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ) ڕوو بكە ئەو شتەی ناتخاتە گومانو گومانی تێدا نیە كە حەڵاڵە، كەوابوو: پێویستە موسوڵمانیتەواو تخونی ئەو شتانە نەكەوێ كە بە تەواوی لە حەڵاڵبوونیان دڵنیا نیە، چونكە بە وازهێنانی گومانلێكراو بە لای كەمی هیچ تاوانی لە سەر نانووسرێ، بەڵام ئەگەر گومانلێكراو بە كار بێنێو بیكا، بە لای كەمی تووشی دوو دڵی ئەبێ ئەگەر نەختێك ترسی خوای هەبێ:

بۆ وێنە: ئەگەر ئافرەتێك پێتی گوت: من شیرم داوەتە تۆو ئەو كچە. ئەمە هەرچەند شاهیدی یەك ئافرەت كار ناكاتە سەر حەڵاڵبوونی مارەكردنی ئەو كچە، بەڵام گومانێكو دوو دڵیەكت بۆ پەیدا ئەبێ، كەوابوو: لە بەر ئەو گومانە واز لەو كچە بێنەو مارەی مەكە، بڕوانە حەدیسی (٦)و (٢٧).

(رواهُ الترمذي والنّسائِي) ئەم دوو زانایە ئەم حەدیسەیان گێڕاوەتەوەو (وقالَ الترمذي: حديث حسن صحيح) ئیمامی (تیرمیزی) فەرموویەتی: ئەم حەدیسە جوانەو ڕاستە.

ئیمامی (تیرمیزی): ناوی (محمد) کوڕی (عیسای) تیرمیزی‌یه، له ساڵی (٢٠٩)ی کۆچی له (تیرمین)-شارێکه له باکوری ئێران- له دایك بووه، له ساڵی (٢٧٩)ی کۆچی، وەفاتی کردوه، ئەویش یەکێکه له زانا بەرزەکانی شەرعو حەدیس.

ئیمامی (نەسسائی) ناوی (ئەحمەد) کوڕی (شوعەیب)ی نەسسائی‌یه، خەڵکی (خوڕاسان)ەو له ساڵی (٢١٥)ی کۆچی له دایك بووه، له ساڵی (٣٠٣)ی کۆچی، له (فەلەستین) وەفاتی کردوه، یەکێك بوو له زانا بەرزەکانی شەرعو حەدیس.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١-(دَعْ مَا يَرِيبُكَ): له سەر بناغەی ئەم حەدیسه قاعیدەیەکی (أُصُول الْفقْه) بنیات نراوه: که ئەڵێ (**إِذَا تَعارَضَ شَكٌّ وَيَقِينٌ قُدِّمَ الْيَقِينُ**) هەرکاتێك گومانێکو بێگومانێك دژ به یەکتری وەستان بێگومانەکه به کار دێ:

**بۆ نموونه:** پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِذا وَجَدَ أَحَدُكُمْ فِي بَطْنِه شَيْئاً فَأَشْكَلَ عَلَيْه أَخَرَجَ مِنْـهُ شَيْءٌ أَمْ لاَ؟ فَلاَ يَخْرُجَنَّ مِنَ الْمَسْجِد حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً أَوْ يَجِـدَ رِيحـاً﴾ رواهُ الشيخان، واته: هەرکاتێك یەکێکتان زانی: له ناو زگی‌دا بایەك هەیه، ئینجا کەوته گومان: ئایا بای لێ‌هاتۆته دەرەوه، یان نا؟ نابێ بەم گومانه له مزگەوت بڕواته دەرەوه بۆ دەستنوێژگرتن، تا به بێگومان دەنگی بایەکه ئەبیسی، یان بێگومان به تەواوی هەست به هاتنه دەرەوەی بایەکه ئەکا. کەواته: (بێگومانی به گومان لاناچێ).

٢- (إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ): هەرکاتێك گومان لێکراوێك ئەکەی ئەبی بزانی: بێگومان پرسیارت لێ‌ئەکرێ، ئایا بۆ وات کرد؟ کەوابوو: ئەی موسوڵمانی خۆشەویست، هەوڵی حەڵاڵو گومان لێنەکراو بده، منداڵەکانت به حەڵاڵ بژێینه تاکو باری دونیاو قیامەتت سوك ببێ، چونکه لەزەتو خۆشی‌ی دونیا به دەوڵەمەندی نیه، تەماشا بکه پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِناً فِي سِرْبِهِ مُعافًى فِي جَسَدِه عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِه فَكَأَنَّما حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيا﴾ رواهُ الترمذي، واته: هەر یەکێك له ئێوه له ڕۆژەکەی‌دا له کۆمەڵگەی خۆی‌دا ئەمین بێو کەس به دوای‌دا نەگەڕێ، لاشەکەی ساغو بێبەلا بێ، ئازووقەی ڕۆژەکەی هەبێ، با وا دابنێ: که هەموو دونیای بۆ کۆ کراوەتەوه.

## ﴿ حەدیسی دوازدەهەم: نەکردنی شتی بێسوود ﴾

(عَـنْ أَبِي‌هُرَيْـرَةَ‌ﷺ قَـالَ) ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ: (قَـالَ رَسُـولُ اللهِﷺ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (مِـنْ حُسْنِ إِسْلاَمِ الْمَرْءِ) یەکێك له نیشانەی جوانیو ڕێکوپێکی ئایینی‌مرۆڤ

تَرْكُــهُ مَا لاَ يَعْـنيهِ﴾ حديث حسن رواهُ الترمذي وَغيرُهُ هَكَذَا.

ئەمەیە: (تَرْكُهُ مَا لاَ يَعْنِيهِ) واز بێنێ لەو شتانەی سودی نیەو پەیوەندی بە خۆیەوە نیە (حديث حسن رواهُ الترمذي وَغيرُهُ هَكَذَا) ئیمامی (تیرمیزی) گێڕاویەتیەوە.

**بزانە:** ئەو شتانەی پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەیە، ئەوەیە بۆ کاروباری ژیانی بێ: وەك زانستیو تەندروستیو خواردنو جلو بەرگو دۆستایەتیو خۆپاراستن لە هەر چی ژیانی تێدا بێو ڕێكوپێككردنی خێزان.

کەوابوو: هەر چی سودی بۆ ژیانی دونیاو قیامەت نەبێ وازی لێبێنەو کاتی خۆتی پێ لە دەست مەدە: وەك گفتوگۆی بێسودو پرسیاری بێسودو هەڵسانو دانیشتنی بێسودو خۆ تێکەڵکردنی کاروباری خەڵك کە پەیوەندی بە تۆوە نەبێ.

**ئینجا بزانە:** یارمەتیدانی خەڵكو ئامۆژگاری کردنو داپۆشینی کەمو کوڕیەکانیان پەیوەندی بە تۆوە هەیەو بە ئەرکی سەر شانی خۆتی بزانە ﴿عَــنْ أَبِي هُرَيْــرَةَ ﷺ: قَــالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اَلْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ، وَالْمُؤْمِنُ أَخُوالْمُؤْمِنِ، يَكُفُّ عَلَيْهِ ضَيْعَتَهُ وَيَحُوطُهُ مِــنْ وَرائِهِ﴾ رواهُ أبوداود، موسوڵمان ئاوێنەی موسوڵمانەو برای موسوڵمانە، بەروبوومەکەی ئەپارێزێو کەمو کوڕیەکانی لائەبا، ئەگەر لە بەر چاویشی نەبێ هەر یارمەتیی ئەدا.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (تَرْكُهُ مَــا لاَيَعْنِيــهِ): پاراستنی نهێنی بەرزترین ڕەوشتی موسوڵمانە، بە تایبەتی داپۆشینو ئاشکرانەکردنی ئەو گوناهەی بە پەنهانی کراوە، چونکە ئاشکراکردنی گوناه ئەبێتە هۆی لێنەبووردنی خوای گەورە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿كُلُّ أُمَّتِي مُعافًى إلاَّ الْمُجاهِرِينَ، وَإِنَّ مِنَ الْمُجاهَرَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلاً ثُمَّ يُصْــبِحُ -وَقَدْ سَتَرَهُ اللهُ- فَيَقُولُ: يَا فُلاَنُ عَمِلْتُ الْبارِحَةَ كَذَا وَكَذَا، وَقَدْ باتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ وَيُصْــبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللهِ عَنْهُ﴾ رواهُ الشيخان، واتە: ئوممەتی من گشتی عەفوکراوە، تەنها ئەوانە نەبن: کە بە ئاشکرایی گوناه ئەکەن، گوناهی ئاشکرا بەوەش ئەگوترێ: کە مرۆڤ لە شەوێدا بە پەنهانی گوناهێك بکا، خوا لێی ئاشکرا ناکا، بەڵام بەخۆی ئەڵێ: فلان دوێنێ ئەم گوناهەم کردوە. ئەو پەردەی خوا بە سەریدا هێنابو و پۆشیبوی، بەم گۆتە بێسودە لای ئەباو گوناهەکە ئاشکرا ئەکاو خوا لێی نابورێ.

٢- (تَرْكُهُ مَا لاَيَعْنِيهِ): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ يُسْأَلُ الرَّجُلُ فِيما ضَرَبَ إِمْرَأَتَهُ﴾ رواهُ أبوداود، پرسیار لە پیاو ناکرێ: ئایا بۆچی لە ژنەکەی خۆی داوە؟ چونکە پرسیارەکە پەیوەندی بە کەسێکیترەوە نیەو بێسودە.

## (اَلْحَدِيثُ الثّالث عَشَر: أُخُوَّةُ الإِسْلاَمِ)

﴿عَنْ أَبِي حَمْزَةَ أَنَسِ بن مالكٍ ﷺ خادِمِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ﴾ رواهُ البُخاري ومُسْلِم.

---

## ﴿حەدیسی سێزدەهەم: برایەتی ئیسلام﴾

(عَنْ أَبِي حَمْزَةَ أَنَسِ بنِ مالكٍ ﷺ) گێڕدراوەتەوە لە (ئەنەس)ی کوڕی (مالیك) ﷺ (خادِمِ رسول اللهِ ﷺ) کە خزمەتکاری پێغەمبەرە ﷺ، کەواتە: سەحابەیە، لە (مەدینە)ی پیرۆز لەدایك بووە، کە پێغەمبەر ﷺ هاتە (مەدینە) تەمەنی (١٠)ساڵان بوو و بووە خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ، تا پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد هەر خزمەتی کرد، لە تەمەنی (١٠٠) ساڵیدا لە شاری (بَصْرَة) وەفاتی کرد. (٢٢٨٦) حەدیسی گێڕاونەوە، ئەفەرموێ:

(أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ) بیروباوەڕی هیچ کامێکتان تەواو نابێ بە خواو پێغەمبەرو ڕۆژی دوایی (حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ) تا بۆ برای خۆی ئەو شتەی پێ خۆش ئەبێ: کە بۆ خۆی پێیخۆشە (رواهُ البخاری ومُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

مەبەست لەو شتانەی کە ئەبی بۆ برای موسوڵمانت پێخۆش بێ، ئەوەیە: لە ئایینی ئیسلامدا ڕەوا بێ، چونکە ئەگەر بەخۆت شتی نارێکت پێخۆشە، نابێ پێت خۆش بێ کەسانیتر بیکا.

لەم فەرموودەیە پێغەمبەر ﷺ هانمان ئەدا: بۆ ئەوەی دڵمان چاکەی بوێ بۆ هەموو کەس، هەتا ئەبی پێمان خۆش بێ برایەکی تاوانبار تۆبە بکا، ئەوەی کافرە موسوڵمان ببێ. هەروەها بەختەوەریت لە دونیاو قیامەت بۆ هەموو کەس پێخۆش بێ، چونکە هیچ لە تۆ کەم نابێتەوە، کەوابوو: حەسودی بە کەس مەبە.

## ﴿چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا﴾

١- (حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ): وا ئەگەیەنێ: کە برایەتیئیسلام پارچەیەکی ئیمانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿اَلإِيمانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً، فَأَفْضَلُها قَوْلُ لاَإِلَـهَ إِلاَّاللهُ، وَأَدْناها إِماطَةُالأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمانِ﴾ رواهُ الشيخان، واتە: ئیمان حەفتاو سێ پارچەیە، لە هەموانیان گەورەتر: شادە هێنانە، لە هەموانیان نزمتر: لابردنی ئازاردەری ڕێگەیە، شەرم کردن پارچەیەکی ئیمانە. بڕوانە حەدیسی (٢٠)م.

٢- (مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ): وا ئەگەیەنێ: کە دڵسۆزی بۆ خەڵك پارچەیەکیتری ئیمانە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿اَلْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى دِمائِهِمْ وَأَمْوالِهِمْ﴾ رواهُ الترمذی، واتە: ئیمانداری تەواو ئەو کەسەیە: خەڵك لە خوێنو ماڵیان لێی ئەمین بن، واتە: لێی دڵنیا بن کە زیانیان لێنادا.

## ( اَلْحَدِيثُ الرَّابِع عَشَر: حُرْمَةُ دَمِ الْمُسْلِمِ )

﴿ عَنْ ابْنِ مَسعودﷺ: قَالَ: رَسُولُ اللهﷺ: لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إلاَّ بِإحْدَى ثَـلاَثٍ: اَلثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِه الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ ﴾ رواهُ البخاري وَمُسْلِم.

---

٣- پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿ذَاقَ طَعْمَ الإيمَانِ: مَنْ رَضِيَ بِاللهِ رَبّاً، وَبِالإسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً﴾ رواهُ مُسْلِم، واتە: ئەو کەسە تامی ئیمان ئەکا: کە ڕازی بێ خوای گەورە دادوەرو پەرستراوی بێ، ئیسلام بەرنامەی ژیانی بێ، محمدﷺ پێغەمبەرو پێشەوای بێ.

### ﴿ حەدیسی چواردەهەم: کوشتنی موسوڵمان حەرامە ﴾

(عَنْ ابنِ مَسعودٍﷺ) عبداللەی کوڕی مەسعود ئەفەرموێ: (قَالَ رسول اللهﷺ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی (لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ) کوشتنی مرۆڤی موسوڵمان دروست نیە (إلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ) تەنها بە کردنی یەکێك لەم سێ تاوانانە دروستە:

**یەکەم:** (اَلثَّيِّبُ الزَّانِي) زیناکردنی پیاوێکە ژنی هێنابێ‌و بوبێتە زاوا، یان ئافرەتێك مێردی کردبێ‌و لێی بوبێتە زاوا، ئەمانە بەردباران ئەکرێن تا دەمرن، بەڵام ئەگەر پیاو ژنی نەهێنابو، یان ئافرەت مێردی نەکردبو، ئەبی یەکێ سەد داریان لێبدرێ‌و ساڵێك لە وڵات دوور بخرێنەوە. هەروەها، نێربازی وەك زینا وایە، بەڵام هەندێ زانا فەرموویانە: ئەبی هەردووکیان بکوژرێن.

**دووەم:** (وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ) کوشتنی بێتاوان بە ئارەزووی خۆی، ئەبی لە تۆڵەی کوژراو بکوژرێتەوە، جا ئەگەر عەفو کرا، ئەبی خوێنی بدا، بەڵام ئەگەر مەبەستی کوشتن نەبو، بەڵکو لە دەستی کوژرا، ئەمە دروست نیە بکوژرێتەوە، بەڵکو ئەبی خوێن بداو خزمەکانی ڕازی بکا: وەك ڕووداوی ئۆتۆمبێل، چەك لە دەست دەرچوون، یاری‌کردنی‌تر.

**بەڵام ئاگاداربە:** لە هەموو جۆرە کوشتنێك-جگە لە تۆڵە- ئەبی کەففارەت بدرێ، واتە: یەك کۆیلە ئازاد بکا ئەگەر هەبوو، ئەگەر نا: ئەبی دوو مانگ لە سەر یەك بە ڕۆژوو بێ.

**سێیەم:** (وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ) وازهێنانە لە ئایینی ئیسلام‌و جیابوونەوەیە لە کۆمەڵی موسوڵمانان، هەر کەس لە ئایینی ئیسلام پەشیمان ببێتەوە، واتە: بە زوبان، یان بە کردەوە کافر ببێ‌و دیسان موسوڵمان نەبێتەوە، ئەبی بکوژرێ‌و ئەگەر کەسێك باوەڕی بە هەر شەش ڕوکنی ئیمان نەبێ، یان جوێن بە خوداو پێغەمبەرﷺ بدا، یان بڵێ: بە حوکمی ئیسلام ڕازی نیم، یان گاڵتە بە خوداو پێغەمبەرو ئیسلام بکا، ئەوە کافرەو کوشتنی واجبە لە سەر کاربەدەستانی موسوڵمانان، هەروەها ئەوەی لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیا ئەبێتەوەو دژ بە ئیسلام ئەوەستێ، ئەبی بکوژرێ (رواهُ البخاري ومُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

جا **بزانە:** ئەوەی کافر ئەبێو موسوڵمان نابێتەوە، لە دوای سێ عیددە پەیوەندی ژنو مێردایەتیی ئەپچڕێ.

**ئینجا بزانە:** گوێڕایەڵیو ڕێزلێنانی کاربەدەستان، ئەرکی سەر شانی گشت موسوڵمانێکە بەو مەرجەی بە یاسای قورئان کار بکا ﴿عَنْ أَبِی ذرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: قالَ النَّبيُّ ﷺ: إنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ مُجَدَّعٌ أَسْوَدُ يَقُودُكُمْ بِكِتَابِ اللهِ فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا﴾ رواهُ مُسْلِم، واتە: ئەگەر قولەڕەشێکی لووت بڕاو، کرایە سەرکردەی ئێوەو بە یاسای قورئان ئێوەی بەڕێوە ئەبرد، ئێوەش گوێڕایەڵی بنو لە فەرمانی دەرمەچون.

**هەروەها بزانە:** هەر کەسێك لە دژی ئەم جۆرە کاربەدەستانە ڕاپەڕیو پەرتەوازەیی بخاتە نێو کۆمەڵی موسوڵمانان، واجبە موسوڵمانان لە ناوی ببەنو نابێ شوێنی بکەون ﴿عَنْ عَرْفَجَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: قالَ النَّبيُّ ﷺ: مَنْ أَرادَ أَنْ يُفَرِّقَ أَمْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ وَهِيَ جَمِيعٌ فَاضْرِبُوهُ بِالسَّيْفِ كَائِناً مَنْ كانَ﴾ رواهُ مُسْلِم، واتە: هەر کەسێك بیەوێ ئەم ئوممەتەی ئیسلام لێك جیا بکاتەوەو پەرتەوازەی بخاتە ناو -لەو کاتەی کە کۆمەڵن- ئێوە بە شمشێر لێی بدن، جا هەر کەسێك بێ.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ): ڕۆژێك (عبدالله)ی کوڕی ئیمامی (عمر) تەماشای (کَعْبَة)ی پیرۆزی کرد -کە قیبلەی موسوڵمانانە- ئینجا فەرمووی: ﴿مَا أَعْظَمَ حُرْمَتَكِ وَالْمُؤْمِنُ أَعْظَمُ حُرْمَةً عِنْدَاللهِ مِنْكِ﴾، ئای (کَعْبَة) چەند گەورەو بەڕێزی، خۆ ئیماندار لە لای خوا لە تۆش گەورەو بەڕێزترە. جا هەر لە بەر گەورەو بەڕێزیی موسوڵمان پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿لَزَوالُ الدُّنْيا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ﴾ رواهُ الترمذی، واتە: نەمانی دونیا ئاسانترە لە لای خوای گەورە لە کوشتنی مرۆڤێکی موسوڵمان.

٢- (الثَّيِّبُ الزَّانِي): **بزانە:** بە شایەدی چوار پیاو، یان بە دان پێداهێنانی زیناکەر زینا ئاشکرا ئەبێ، دیسان **بزانە:** هەر جۆرە زیناکەرێك هەبێ، ئەگەر زینایەکەی لێ ئاشکرا نەبو، با لە نێوان خۆیو خوای گەورەدا تۆبە بکاو ئاشکرای نەکا، بەم تۆبەیە -إِنْ شاءَ اللهُ- خوای گەورە لێی خۆش ئەبێ، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ أَصابَ شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ فَعُوقِبَ بِهِ فِي الدُّنْيا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصابَ شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ فَسَتَرَهُ اللهُ عَلَيْهِ فَأَمْرُهُ إِلَى اللهِ: إِنْ شاءَ عَفا عَنْهُ، وَإِنْ شاءَ عَذَّبَهُ﴾ رواهُ الشيخان، واتە: هەر کەسێك تاوانێکی لەم تاوانانە کرد -جگە لە کافربوون- ئەگەر لە دونیا بە هۆی ئەم گوناهە سزا درا، ئەوە سزای قیامەتی لە سەر لائەچێ، بەڵام ئەگەر تاوانێکی لەم تاوانانە کرد -جگە لە کافربوون- ئینجا خوا لێی پۆشیو

## (اَلْحَدِيثُ الْخامس عشر: فِي خصال الْمُؤْمِن)

﴿ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ ﴾ رواهُ الْبُخاري ومُسْلِم.

---

ئاشکرای نەکرد، ئەوە لە ڕۆژی دوایی لە دەست خودایە، ئەگەر حەز بکا: لێی ئەبورێ، ئەگەر نا: سزای ئەدا. واتە: هەرچەند بە بێتۆبەکردنیش بمرێ.

٣- (وَالتَّارِكُ لِدِينِه): جیاوازی نیە: واز لە هەموو ئایین بهێنێ، یان لە بەشێکی، بگەڕێوە بۆ حەدیسی (٨)م.

٤- (اَلْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَة): مەبەست بە کۆمەڵ (أهل السنّة والجَماعة)یە، واتە: هەر چینێك بۆ بڵاوکردنەوەی (بِدْعَة) چەك هەڵگری: ئەبی جەنگیان لەگەڵ بکرێ، هەروەکو ئیمامی (عَلِی) جەنگی لەگەڵ (خَوارج) کرد.

### ﴿ حەدیسی پازدەهەم: ڕەوشتەکانی مرۆڤی ئیماندار ﴾

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ) ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ) هەر کەسێك باوەڕی تەواوی هەیە بە خواو ڕۆژی دوایی (فَلْيَقُلْ خَيْرًا) با قسەی باش بکا (أَوْ لِيَصْمُتْ) یان بێدەنگ بێ.

لەم فەرموودەیە دەرئەکەوێ: قسەی بە سود پێویستە بگوترێ، بە مەرجێ ڕووداوێکی نالەبار ڕوو نەدا، وە ئەگەر قسەکردن سودی نەبێ، پێویستە نەگوترێ، چونکە زۆربەی تاوانی ئادەمیزاد کە لە دونیاو قیامەت پێی بەدبەخت ئەبێ: لە گفتوگۆی نالەبار ڕوو ئەدا، بۆیێ (لوقمان) ئەڵێ: (**ئەگەر قسە زیو بێ، نەگوتنی زێڕە**).

(وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ) وە هەرکەسێك باوەڕی تەواوی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێزی دراوسێی خۆی بگرێو ئازاری نەداو ئاگاداری ماڵو منداڵی بێو ئامۆژگارییان بکاو یارمەتییان بدا.

**بزانە:** دراوسێی موسوڵمانو خزم سێ مافی هەنە، دراوسێی موسوڵمانو بێگانە دوو مافی هەنە، دراوسێی کافر یەك مافی هەیە.

(وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ) وە هەرکەسێك باوەڕی تەواوی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێزی میوانی بگرێو لەگەڵی ڕووخۆش بێو بەگوێرەی توانا خواردنی بداتێو شوێنی نوستنی بۆ دابین بکاو لە بەردەم میوانا ڕووگرژیو دەمەقاڵێ لەگەڵ منداڵانی خۆی نەکا، هەروەها نابێ میوانیش خۆی ناشیرین بکا: وەك داوای خواردنی تایبەتی بکا، یان خۆی تێکەڵی کاروباری خاوەن ماڵ بکا، ئەگەر شتێکی ناڕێکی دیت، نابێ بڵاوی بکاتەوە (رواهُ البخاري ومُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

**ئینجا بزانە:** ئەم سێ ڕەوشتانە ڕەوشتی موسوڵمانی ڕاستەقینەیەو هەر بە ڕەوشتی باش موسوڵمانان بە بەهەشت شاد ئەبن ﴿عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَ رضي الله عنه: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الْجَنَّةَ؟ فَقَالَ: تَقْوَى اللهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ. وَسُئِلَ عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ النَّارَ؟ فَقَالَ: اَلْفَمُ وَالْفَرْجُ﴾ رواهُ الترمذي، واتە: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا: ئایا زۆرترین شت کە خەڵکی بباتە بەهەشت چی‌یە؟ فەرمووی: لە خواترسیو ڕەوشتی باش. ئایا زۆرترین شت کە خەڵکی بباتە دۆزەخ چی‌یە؟ فەرمووی: زمان پیسیو داوێن پیسی.

### ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (فَلْيَقُلْ خَيْراً): ئیمامی (الشافعی) ئەفەرموێ: **(با قسەی باش بکا، بەڵام پاش بیرکردنەوە: ئایا ئەم قسەیەی ئەیکا باشە، یان نا، ئینجا ئەگەر دڵنیابو کە قسەکە باشە با بیکا، بەو مەرجەی ناڵەباری ڕوو نەدا).**

ئیمام (أبوعلی الدقاق) ئەفەرموێ: (**مَنْ سَكَتَ عَنِ الْحَقِّ فَهُوَ شَيْطَانٌ أَخْرَسُ**) هەر کەسێك لە گوتنی ڕاستیو ڕەوا بێدەنگ بێ، ئەوە شەیتانێکی لاڵە.

**ئینجا بزانە:** لە هەر کاتو شوێنێك بەرژەوەندی لە قسەکردندا نەبو، ئەوە بێدەنگی باشەو حەسانەوەیەکە بۆ خۆیو فریشتەکان، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ تُكْثِرُوا الْكَلاَمَ بِغَيْرِ ذِكْرِ اللهِ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الْكَلاَمِ بِغَيْرِ ذِكْرِ اللهِ قَسْوَةٌ لِلْقَلْبِ، وَإِنَّ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنَ اللهِ اَلْقَلْبُ الْقَاسِي﴾ رواهُ الترمذی، واتە: زۆر قسە مەکەن بە قسەیەکی وا: کە زیکری خواو چاکە نەبێ، چونکە زۆر گوتن بە بێزیکری خوا: ئەبێتە هۆی دڵڕەقی، بەڕاستی دوورترین کەس لە خوای گەورە دڵی‌ڕەقە. کەوابوو: **(زۆر گۆتن، قوڕئان خۆشە).**

٢- (فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ): دراوسێ تا چل خانوو لە ڕاستەو چەپەو باکور و باشوری خانووەکەت ئەگرێتەوە.

**ئینجا بزانە:** ڕێزلێنانی دراوسێ نیشانەی ئیمانی‌تەواوە، هەروەکو لەم حەدیسەدا دەرئەکەوێ، هەروەها ئازاردانی دراوسێ هۆی دواکەوتنە لە بەهەشت، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لاَ يَأْمَنُ جارُهُ بَوائِقَهُ﴾ رواهُ مُسْلِم، واتە: ناچێتە بەهەشت کەسێك دراوسێیەکەی لە خراپەی ئەمین نەبێ. کەوابوو: بۆ دراوسێیەکەت دڵسۆز بەو لە خواردنی خۆت بێبەشی مەکە.

٣- (فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ): دەربارەی مێوانو مێوانداری پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، جائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَالضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، فَما بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ، وَلاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَثْوِيَ عِنْدَهُ حَتَّى يُحْرِجَهُ﴾ رواهُ أبوداود، هەر کەسێك باوەڕی بە خواو

## (اَلْحَديثُ السّادس عَشَر: في الْغَضَب)

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَوْصِنِي. قَالَ ﷺ: لاَ تَغْضَبْ. فَرَدَّدَ مِرارًا. قَالَ ﷺ: لاَ تَغْضَبْ﴾ رواهُ الْبُخاري.

---

ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێز لە میوانەکەی بنێ، بە شێوەیەکی وا: شەو و ڕۆژێك بەگوێرەی توانا خواردنی باشی بداتێ، مافی میوانداری سێ ڕۆژە بە خواردنی عادەتی، لە سێ ڕۆژ زیاتر خێرکردنە بە میوان، دروست نیە میوان ئەوەندە بمێنێتەوە: تا خاوەن ماڵ تووشی ئازارو ماندووبوون ئەکا. کەوابوو: لە جێگەی تایبەتی خاوەن ماڵیش دامەنیشە.

ئینجا لە دوای نان خواردن ئەم دوعایە بۆ خاوەن ماڵ بکە: ﴿أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ وَأَكَلَ طَعامَكُمُ الأَبْرارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ﴾ رواهُ أبوداود، واتە: خوا بکا ڕۆژووەوانان فەتار لە لای ئێوە بکەنەوە، پیاوچاکان نانی ئێوە بخۆن، فریشتە بۆ ئێوە لە خوا بپاڕێنەوە تا لێتان خۆش بێ.

### ﴿ حەدیسی شازدەهەم: دەربارەی توڕەیی ﴾

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ) ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێ ئەفەرموێ: پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ گوت: (أَوْصِنِي) ئامۆژگاری‌یەکم پێ بسپێرە جێبەجێی بکەم (قَالَ: لاَ تَغْضَبْ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: توڕە مەبە.

(فَرَدَّدَ مِرارًا) جا پیاوەکە چەند جارێکی تر ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە (قَالَ: لاَ تَغْضَبْ) پێغەمبەر ﷺ هەر وەڵامی ئەداوەو ئەیفەرموو: توڕە مەبە.

واتە: کە توڕەش بوی، قسەی نارێك مەکەو هەڵمەتی دڕندانە مەبە، چونکە مرۆڤی ئازا ئەوەیە: لە کاتی توڕەبوون خۆڕاگر بێو لێبوردن بکاتە پیشەی خۆی.

توڕەبوون سەرەتابیەکەی شێتی‌یەو دوایی‌ی پەشیمانی‌یە، لە بەر ئەوە زۆر کەس لە بەر توڕەیی: یان خۆی کافر ئەکاو لە ئیسلام دەرئەچێ، یان کەسێك ئەکوژێ، یان سوێند ئەخوا، یان ژنی خۆی تەڵاق ئەداو ماڵی خۆی وێران ئەکا (رواهُ البخاری) ئیمامی (بوخاری) گێڕاویەتیەوە:

ئینجا بۆ ڕزگاربوون لە دەردی توڕەیی، پێغەمبەر ﷺ چەند دەرمانێکی داناوە پێویستە بە کاریان بێنین: وەك دەستنوێژ شوشتن، گوتنی (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ)، دانیشتن ئەگەر بە پێوە بوو، یان پاڵدانەوە ئەگەر دانیشتوو بێ.

ئەوەش **بزانە:** ئەگەر ویستت دۆستایەتی کەسێك بکەی، جارێك توڕەی بکە بۆ ئەوەی بزانی چ جۆرە کەسێکە؟ چونکە دەرنەبڕینی توڕەیی‌و مراندنەوەی ڕقو قین لە ڕەوشتە هەرە بەرزەکانی موسوڵمانە، بە مەرجێ دەسەڵاتی هەبێ نەك لە بەر بێدەسەڵاتی بێ.

## (اَلْحَديثُ السّابع عَشَر: إحْسانُ الْعَمَلِ)

﴿عَنْ أَبِي يَعْلَى شَدَّاد بن أَوْسٍ رضي الله عنه: عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قالَ: إنَّ اللهَ كَتَبَ الإحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ: فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ﴾

### ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (أَوْصِنِي): وا ئەگەیەنێ: پێویستە موسوڵمان داوای ئامۆژگاری لە موسوڵمان بکا، چونکە هەموو کەسێك لە کەم و کوڕیەکانی خۆی ئاگادار نیەو موسوڵمانی دڵسۆز ئاگاداری ئەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَحَدَكُمْ مِرْآةُ أَخِيهِ، فَإِنْ رَأَى بِهِ أَذىً فَلْيُمِطْهُ عَنْهُ﴾ رواهُ الترمذی، واتە: بە ڕاستی هەر یەکێکتان ئاوێنەی برای خۆیەتی، کەوابوو: هەر ناشیرینیەکی لە برای خۆی دیت ئەبی لای ببا.

٢- (لاَ تَغْضَبْ): توڕەیی: وەجۆش هاتنی خوێنە بۆ ڕونەدانی سەرشۆڕی، یان بۆ تۆڵەوەرگرتن، ئەم وەجۆش هاتنە وا لە مرۆڤ ئەکا: دەماری جووت ئەبێ و ڕەنگی تێك ئەچێ و دەمی کەف ئەکاو گوفتارو کرداری نالەبار ئەبێ، ئەگەر لەم کاتەدا خۆی ببینێ، لە شەرمی ڕەنگی نالەباری خۆی توڕەیی نامێنێ.

**ئینجا بزانە:** ڕەوشتە باشەکانی ئیسلام، باشترین دۆستن بۆ زاڵبوون بە سەر توڕەییدا، کەوابوو: ئەگەر توڕەش بووی، توڕەییت بشارەوەو ئەنجامی مەدە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ كَظَمَ غَيْظاً وَهُوَ قادِرٌ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ دَعاهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ عَلَى رُؤُوسِ الْخَلائِقِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ مِنْ أَيِّ الْحُورِ الْعِينِ شاءَ﴾ رواهُ الترمذي، هەرکەسێك ڕق و توڕەیی بشارێتەوە -توانای ئەنجامدانیشی هەبێ- خوای گەورە لە بەرچاوی خەڵك لە ڕۆژی دوایی بانگی ئەکا، تاکو بیکاتە سەرپشك: کام حۆری هەڵبژێرێ بیداتێ.

### ﴿ حەدیسی حەڤدەهەم: ڕێك و پێك کردنی کردار ﴾

(عَنْ أَبِي يَعْلَى شَدَّادِ بنِ أَوْسٍ) رضي الله عنه (شەدداد)ی کوڕی (ئەوس) سەحابەیە، لە (مەدینە)ی پیرۆز لە دایك بووە، لە ساڵی (٥٨)ی کۆچی لە (بَيْتِ المُقَدَّس) وەفاتی کردوە، (٥٠) حەدیسی گێڕاونەوە.

(عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ) لە پێغەمبەر ﷺ ئەگێڕێتەوە: (قالَ: إِنَّ اللهَ كَتَبَ الإحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە واجبی کردوە: کە چاکە لەگەڵ هەموو شتێکا بە کار بێنن:

(فَإِذَا قَتَلْتُمْ) جا ئەگەر هاتوو کەسێکتان کوشت (فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ) بە شێوەیەکی باش بیکوژن. واتە: ئەگەر لە تۆڵەی باوکت، یان برات، یان کوڕت، کەسێکت کوشت لە کوشتن بەولاوە هیچیتری لێمەکە: وەك دەم و لوت بڕین و ناشیرین کردنی لاشەکەی،

یان ئەگەر کەسێك هەڵمەتی هێنایە سەر ماڵو ناموستو نەگەڕاوە، ئەوە لە کوشتن بەولاوە هیچیتر دروست نیە ﴿عَنْ سَعِيد بنْ زَيْدﷺ: قالَ النَّبيُّﷺ: مَنْ قُتِلَ دُونَ مالِه فَهُوَ شَهِيدٌ﴾ رواهُ الترمذي، واتە: هەرکەسێك بە هۆی پاسەوانیکردنو بەرگریکردن لە ملكو ماڵی خۆی بکوژرێ شەهیدە.

(وَإِذَا ذَبَحْتُمْ: فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَةَ) وە هەر کاتێك ئاژەڵێکی حەلاڵتان سەر بڕی، بە شێوەیەکی باش سەری ببڕن: هەروەك پێغەمبەرﷺ ڕێی بۆ داناوینو ئەفەرموێ: (وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ) هەر یەکێك سەری ئاژەڵ ببڕێ، با کێردەکەی تیژ بکا (وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ) وە پشوودانێکی باش بداتە ئاژەڵەکە: وەك ئاودانو خستنە سەر تەنیشتی چەپە، ئینجا ڕووی لە قیبلە بکاو بڵێ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم). وە بە زووترین کات کێردەکەی بێنە بە سەر گەرووی‌داو بیکوژەوە (رواهُ مُسْلِم) ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

**ئەوەش بزانە:** ئەبی لە کوشتنەوەدا (سۆریچك) کە بۆڕی‌ی خواردنو خواردنەوەیەو (قرتاکە) کە بۆڕی‌ی هەناسەیە، هەردووکیان ئەبی بە تەواوی ببڕدرێنو ئەو گرێیەی لە گەروو بەرز ئەبێتەوە ئەبی کوشتنەوەکە لە ئەویان بەرەو خوار بێ بۆ لای لاشەکە، یان لە سەر ئەو بێ، بۆ ئەوەی هەندێکی، یان هەمووی بە لای سەریەوە بچێ، ئەگەر هیچی بە لای سەریەوە نەچو، حەرامەو مردارە

**ئینجا بزانە:** (بِسْمِ اللهِ)کردن لە کاتی کوشتنەوەدا مەرج نیە، هەروەها بە دەستی منداڵو ئافرەتیش سەربڕینی ئاژەڵو باڵندە هەر دروستە ﴿عَنْ كَعْب بن مالكﷺ: أَنَّ امْرَأَةً ذَبَحَتْ شاةً بِحَجَرٍ فَسُئِلَ النَّبيُّﷺ عَنْ ذَلِكَ؟ فَأَمَرَ بِأَكْلِهَا﴾ رواهُ البخاري، واتە: ئافرەتێك بە بەردێکی تیژ مەڕێکی سەربڕی، پێغەمبەرﷺ فەرمانیدا گۆشتی مەڕەکە بخۆن.

**﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾**

١- (إِنَّ اللهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ): **چاکە:** ئەنجامدانی کردارەکانە بە پێی یاسای ئیسلام، جیاوازی نیە: ئەم کردارە پەیوەندی بە خۆتەوە هەبێ، یان بە کەسێکیتر.

**ئینجا بزانە:** هەر هەوڵدانێك بۆ بەڕێوەبردنی خەڵكو ڕێککردنی کۆمەڵگە بێ، ئەوە بە چاکە دائەندرێو ڕێبازی پێغەمبەرانە علیهم الصلاة والسلام، ئەم هەوڵدانە لە ئیسلامدا بە (سیاسَة) ناو ئەبرێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿كَانَتْ بَنُو إِسْرائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ كُلَّما هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ﴾ رواهُ الشيخان، واتە: پێغەمبەرەکان علیهم الصلاة والسلام کاروباری (بَنِي إِسْرائيل)یان بەڕێوە ئەبردو ڕابەرایەتی دینو دونیایان ئەکردن، هەر پێغەمبەرێك وەفاتی کردبا: پێغەمبەرێکیتر ئەم سیاسەتەی ئەنجام ئەدا.

## ( اَلْحَدِيثُ الثّامِن عَشَر: فِي تَقْوَى اللهِ، وَحُسْنِ الْخُلُقِ )

﴿ عَنْ أَبِي ذَرٍّ جُنْدُب بن جُنادَةَ رضي الله عنه وَأَبِي عَبْدِالرَّحْمَنِ مُعاذ بن جَبَلٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قالَ: اتَّقِ اللهَ حَيْثُما كُنْتَ،

---

٢- (فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ): **بزانه:** شێواندنو ناشیرین کردنی لاشەی کوژراوەکە بە هیچ شێوەیەك دروست نیە، هەرچەند لاشەی دوژمنێکی کافریش بێ ﴿عَنْ عَبْد الله بن زَيْد رضي الله عنه: قالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ: عَنِ النُّهْبَى وَالْمُثْلَةِ﴾ رواهُ البخاري، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە -لە غەزادا- تالان ببەین پێش دابەشکردنی، قەدەغەی کردوە: لاشەی کوژراوەکان بشێوێنینو ناشیرینیان بکەین.

٣- (فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَةَ): شێوەی سەربڕینی باش ئەوەیە: بە هێمنیو لە سەرخۆیی ئاژەڵەکە درێژ بکاتە سەر زەمین، لە بەرچاوی ئاژەڵەکە چەقۆ تیژ نەکا، لە پێش چاوی ئاژەڵەکە ئاژەڵێکیتر سەر نەبڕێ، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿اَلرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَانُ، إِرْحَمُوا أَهْلَ الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّماءِ﴾ رواهُ أبوداود والترمذي، ئەوانەی بەزەییان دێتەوە خوای گەورە ڕەحمیان پێئەکا، بەزەییتان بە دانیشتووانی زەمیندا بێتەوە تاکو خوای گەورەو دانیشتووانی ئاسمان بە زەییان پێتان بێتەوە.

### ﴿ حەدیسی هەژدەهەم: ترسان لە خوا، ڕەوشت جوانی ﴾

(عَنْ أَبِي ذَرّ جُنْدُبِ بن جُنادَةَ رضي الله عنه) گێڕدراوەتەوە لە (ئەبوزەڕ)ی (غیفاری) خوا لێی ڕازی بێ: سەحابەیە، پێنجەمین کەسە: کە موسوڵمان بووە لە (مەککە)ی پیرۆز، ئینجا گەڕاوەتەوە بۆ ناو خزمەکانی، ئینجا کۆچی کرد بۆ (مەدینە)، لە ساڵی (٣١)ی کۆچی وەفاتی کردوە، (٢٨١) حەدیسی گێڕاونەتەوە.

(و)هەروەها گێڕدراوەتەوە لە (أَبِي عَبْدِالرَّحْمَنِ مُعاذ بن جَبَلٍ) رضي الله عنه (موعاز)ی کوڕی (جەبەل) خوا لێی ڕازی بێ، سەحابەیەو لە (مەدینە)ی پیرۆز لە تەمەنی (١٨) ساڵیدا موسوڵمان بووە، لە ساڵی (١٨)ی کۆچی لە نزیك (ئوردون) وەفاتی کردوە، (١٥٧) حەدیسی گێڕاونەتەوە.

ئەم دوو بەڕێزانە ئەگێڕنەوە: (أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اِتَّقِ اللهَ) لە خوا بترسەو خۆت لە تووڕەیی خوا بپارێزە (حَيْثُما كُنْتَ) لە هەر شوێنێ بووی: خەڵکت لێ دیار بێ، یان نا.

**بزانە:** (تَقْوى) واتە: ترسانو خۆپاراستن لە تووڕەیی خوا، بەم جۆرە: لە فەرمانی دەرنەچی، هەرچی قەدەغەی کردوە نەیکەی، تا توانات هەیە خودات هەر لە یاد بێو لە سەر زوبانت بێ.

وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ﴾ رواهُ التِّرْمِذي وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَن. وَفِي بَعْضِ النُّسَخِ: صَحِيحٌ.

**ئینجا بزانە:** خۆپاراستن لە تورەیی خوا ئەبێتە هۆی شارەزابوون بۆ لێکجیاکردنەوەی چەوتیو ڕاستی، هۆی سەربەرزی لە دونیاو قیامەت، هۆی سەرکەوتنو ڕزگاربوون لە ناخۆشی، هۆی وەدەستهێنانی ڕزقی حەڵاڵ، هۆی گونجانی کاروباری دونیایی، هۆی نەترسانو دڵ تەنگ نەبوون لە دونیاو قیامەت: بە مەرجێ ئەم (تَقْوى)یە لە ژێر یاسای ئیسلام بێو بە بێشەرعی نەبێ.

(وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ) بە دوای هەر گوناهێکدا چاکەیەك بکە (تَمْحُهَا) بۆ ئەوەی ئەم چاکەیە خراپەکە لاباو بیسڕێتەوە.

**ئاگاداری:** ئەو گوناهانەی بە چاکەکردن لائەچن: تەنها گوناهی بچووکن، ئەویش بەو مەرجەی خۆی لە گوناهی گەورە بپارێزێ، کەوابوو: بەدبەخت ئەو کەسەیە: کە چاکەکانی لە گوناهە بچووکەکانی زیاتر نەبن، یان چاکەکانی ڕێگای لابردنی گوناهە بچووکەکانی نەبێ: بە هۆی ڕێگەگرتنی گوناهە گەورەکان.

**ئینجا بزانە:** گوناهی گەورە: وەکو کوفر، کوشتنی بە ناهەق، زینان ئارەق خواردنەوە...هتد، بە تۆبەکردن لائەچن. واتە: پەشیمان ببیەوەو داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەی، جا ئەگەر گوناهەکە پەنهانی بوو: ئاشکرای مەکەو لە نێوان خۆتو خوادا تۆبە بکە، خودا لێت خۆش ئەبێ.

**ئەوەش بزانە:** هەر گوناهێك: چ بچووك بێ، چ گەورە، کە پەیوەندی بە ئادەمیزادەوە هەبێ: ئایا دەربارەی خوێن، یان ماڵ، یان نامووس، ئەمە-جگە لە تۆبەکردن- ئەبی خاوەنەکەی لە خۆت ڕازی بکەی، ئەگەر نا: خوا تۆبەت قبوڵ ناکا-(بگەڕێوە بۆ حەدیسی دەیەم)- جا کە ئەوەت زانی مافی خەڵك بە تۆبە لاناچێ، بە زووترین کات هەوڵ بدە خاوەن ماف گەردەنت ئازاد بکا بە دڵێکی ڕازیکراو.

(وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ) هەروەها ڕەوشتت باش بێ لەگەڵ هەموو کەس، واتە: ڕووخۆشو شیرین گوفتار بە، بۆ یارمەتی هەموو کەس ئامادە بە، ڕقو قینە دەرمەبڕە، لێبوردن بکە بە پیشەی خۆت، شەرمو ڕێزت بۆ گەورە، بە زەیی بۆ بچووك نیشانەی زۆر باشیتە، نزیکترین کەس لە پێغەمبەرﷺ ڕۆژی دوایی ڕەوشت باشەکانن، بە ڕەوشتی باش ئەگەیتە پلەی پیاوچاکان (رَوَاهُ الترمذي وَقَالَ حَدِيثٌ حَسَن) ئیمامی (تیرمیذی) گێڕاویەتیەوەو ئەفەرموێ: حەدیسێکی جوانە.

**ئینجا بزانە:** ترسان لە خوای گەورە وات لێئەکا ڕەوشتت باش بێ لەگەڵ هەموو کەس، ڕەوشتێ باش گشتی چاکەیە، لە پاداشتی قیامەتت زیاد ئەکاو باری تاوانەکانت لە سەر

لائەبا ﴿عَنْ جابر رضي الله عنه: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: كُلُّ مَعْرُوف صَدَقَةٌ وَإِنَّ مِنَ الْمَعْرُوف أَنْ تَلْقَى أَخاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ، وَأَنْ تَفْرُغَ مِنْ دَلْوِكَ فِي إِناءِ أَخِيكَ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، واتە: هەر چاکەیەکی بکەی خێرەو پاداشتت بۆ ئەنوسرێ، وە ڕووخۆشیو زەردەخەنەیی لە ڕووی برای موسوڵمانت ئەویش خێرە، هەروا بەخشینی نەختێك ئاو لە دۆڵچەی خۆتەوە کە بیڕژێنیە ناو دۆڵچەی برای خۆت، ئەویش هەر خێرە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (اتَّقِ اللهَ حَيْثُمَا كُنْتَ): **بزانە:** (تَقْوى)، واتە: لە خواترسان بە جۆرێکی وا: لەو شوێنانە نەتبینێ: کە لێی قەدەغە کردویو لەو شوێنانەت گوم نەکا: کە فەرمانی پێکردوی، (تَقْوى) ئەبێتە هۆی بەختەوەری لە دونیاو قیامەت، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِالدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو لە خوا ترساون، موژدەیان بۆ هەیە لە ژیانی دونیاو لە ڕۆژی قیامەت، بڕیارەکانی خوا گۆڕانی بە سەردا نایێ، ئەم موژدەیە: سەرفرازی‌یەکی گەورەیە بۆ لە خواترسەکان.

٢- (وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا): خێرکردنو نوێژ کردنو (أَسْتَغْفِرُ اللهَ)و (وَسُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ)و خەریکبوون بە زانستی ئایینیو...هتد: چاکەکان گشتی گوناهە بچووکەکان ڕەش ئەکەنەوە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ﴾ بەڕاستی چاکەکان تاوانەکان لائەبەن، ئەمە ئامۆژگاری‌یە بۆ ئەوانەی ئامۆژگاری وەرئەگرن.

٣- (خَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ): **بزانە:** خوای گەورە مەدحی پێغەمبەری ﷺ کردوە بە ڕەوشتی باش، هەروەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ بە ڕاستی ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ لە سەر ڕەوشتێکی جوانو گەورەی.

جا کە ڕەوشتی باش ڕەوشتی پێغەمبەرمان بێ ﷺ، زۆر حەیفە موسوڵمان لە دەست خۆی بدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿خِيَارُكُم أَحاسِنُكُمْ أَخْلاَقاً﴾ رواهُ الشيخان، باشترینتان ڕەوشت جوانترەکانتانن.

## ﴿ حەدیسی نۆزدەهەم: پاراستنی مافی خواو، بیروباوەڕ ﴾

(عَنْ أَبِي الْعَبَّاس عَبْدالله بن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما) گێڕدراوەتەوە لە (ئیبن عەبباس)، ناوی (عبدالله) کوڕی ئیمامی (عەبباس)ی مامی پێغەمبەرە ﷺ، واتە: خۆیو باوکی سەحابەنە،

قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ النَّبيِّ ﷺ يَوْمًا، فَقَالَ ﷺ: يَا غُلاَمُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: احْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ، وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ تَعَالَى لَكَ،

---

له (مەککە)ی پیرۆز له دایك بووه، لەگەڵ باوکی کۆچی کردوه بۆ (مەدینە)، کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد تەمەنی (١٣) ساڵان بوو، لە شاری (طائف) ساڵی (٦٨)ی کۆچی وەفاتی کرد، (١٦٦٠) حەدیسی گێڕاوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کرد: (خوا زانستی قورئانی بداتێ).
یەکێکە لە چوار (عبدالله)یەکان، بڕوانە حەدیسی سێیەم.

(قَالَ) ئەفەرموێ: (كُنْتُ خَلْفَ النَّبيِّ ﷺ، يَوْمًا) ڕۆژێك لە پشت پێغەمبەر ﷺ سواری وولاغێك بوم (فَقَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (يَا غُلاَمُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ) ئەی ڕۆڵە، من چەند قسەیەکی بە سودت فێر ئەکەم:

(احْفَظِ اللهَ) ئاگات لە خودا بێو فەرمانی جێبەجێ بکەو قەدەغەی مەشکێنە (يَحْفَظْكَ) خوداش تۆ ئەپارێزێو ئاگاداری ماڵو منداڵو ئایینت ئەکاو لە ڕۆژی دواییش ڕزگارت ئەکا (احْفَظِ اللهَ) ئاگات لە خودا بێ (تَجِدْهُ تُجَاهَكَ) دەبینیت خوا لەگەڵتایەو لە کاتی تەنگانە فریات ئەکەوێ.

(إِذَا سَأَلْتَ) هەر کاتێك ویستت شتێك داوا بکەی (فَاسْأَلِ اللهَ) هەر لە خوا داوای بکە، چونکە گەنجینەی ئاسمانو زەمین هەر بە دەست ئەوە، کەوابوو: نەچی لە بەر نەبوونیو هەژاری، خوا لە بیر خۆت ببەیەوەو دەست بە تاوانباری بکەی، یان ملکەچی بۆ پیاوی نامەردو تاوانبار بکەی، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الرِّزْقَ لَيَطْلُبُ الْعَبْدَ أَكْثَرَ مِمَّا يَطْلُبُهُ أَجَلُهُ﴾ رواهُ الطبراني، واتە: ڕزق بە دوای بەندەدا ئەگەڕێو ئەو بەشەی بۆی داندراوە گشتی ئەدرێتێ لە دونیادا، زۆرتر لە ئەجەلەکەی. واتە: کاتی دیارکراو بۆ مردنی.

(وَإِذَا اسْتَعَنْتَ) هەر کاتێك ویستت داوای یارمەتی بکەی (فَاسْتَعِنْ بِاللهِ) هەر لە خوا یارمەتی داوا بکە، چونکە ئەگەر خودا یارمەتیدەرت بێ کەس پێت ناوەستێ.

ئینجا بۆ ئەوەی باشتر بزانین هەموو شت بە دەست خوایەو کەس بە بێویستی خوا هیچی لە دەست نایێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (وَاعْلَمْ) بزانە: (أَنَّ الأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ) ئەگەر هەموو خەڵك کۆ ببێتەوە (عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ) بۆ ئەوەی سودێکت پێ بگەیەنن: کەم، یان زۆر (لَمْ يَنْفَعُوكَ) ناتوانن سودت پێبگەیەنن (إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ تَعَالَى لَكَ) مەگەر ئەو سودە بە تۆ بگەیەنن: کە لە یەکەم ڕۆژدا خوا بۆتی نووسیوە، کەوابوو: سودبەخشی ڕاستەقینە هەر خودایە.

وَلَوِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَـــيْءٍ قَــدْ كَتَبَــهُ اللهُ عَلَيْــكَ، رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ ﴾ رواهُ التِّرمذى وَقــالَ: حــديثٌ حَسَــنٌ صَــحيح.

وَفى رِوايَةِ غَيْرِ التِّرمذى: ﴿ احْفَظِ اللهَ تَجِــدْهُ أَمَامَــكَ، تَعَــرَّفْ إِلَــى اللهِ فِى الرَّخَــاءِ يَعْرِفْكَ فِى الشِّدَّةِ، وَاعْلَمْ أَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ وَمَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَاعْلَمْ أَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ وَأَنَّ الْفَرَجَ مَعَ الْكَرْبِ وَأَنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴾.

---

(وَلَوِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ) وه ئەگەر هەموو خەڵك كۆ ببێتەوه بۆ ئەوەی زیانێكت تووش بكەن (لَمْ يَضُرُّوكَ) ناتوانن زیانت لێبدەن (إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ) مەگەر ئەو زیانەت لێبدەن: كە لە یەكەم ڕۆژدا خوا لە چارەی نووسیوی.

(رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ) قەڵەم پێچراوەتەوه (وَجَفَّتِ الصُّحُفُ) نووسراوەكە ووشك بۆتەوه، هیچ گۆڕانێك نایەتە سەر نووسراوی خوا، كەوابوو: ئەی موسوڵمان: پشتت هەر بە خوا ببەستە، واز لە ملكەچی بۆ خەڵك بێنە، هەر خوای گەورە بناسە، هەموو شتێك لە دەست خودایەو بڕاوەتەوه

(رواهُ الترمذى وَقالَ: حديثٌ حَسَنٌ صَحيح) ئیمامی (تیرمیزی) گێڕاویەتیەوه.

(وَفِى رِوايَةِ غَيْرِ التِّرمِذى) جگە لە (تیرمیزی) لە گێڕانەوەی ئیمام (أحمد)و (عبد بن حمید)دا هاتوه: (احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ أَمَامَكَ) ئاگاداری خودا بە، خودا ئاگادارت ئەبێ.

(تَعَرَّفْ إِلَى اللهِ) خۆت بە خوا بناسێنە (فِى الرَّخَاءِ) لە كاتی خۆشیو هەبوونیدا (يَعْرِفْكَ فِى الشِّدَّةِ) خوداش لە كاتی تەنگانەدا ئەتناسێتەوەو لە هاوارت دێ، واتە: لە كاتێكدا: كە لە خۆشیدای زۆر خوا بپەرستە بۆ ئەوەی خۆشی بوێ، ئینجا لە تەنگانەدا زوو فریات ئەكەوێو ڕزگارت ئەكا.

(وَاعْلَمْ) باش بزانە (أَنَّ مَا أَخْطَأَكَ) ئەوەی بۆ تۆ نابێ لە چاكەو لە خراپە (لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ) هەر لە یەكەم ڕۆژدا بۆ تۆ دانەندراوه، كەوابوو: وا مەزانە: بەشی تۆ دراوە بە یەكێكی تر.

(وَمَا أَصَابَكَ) وه ئەوەی پێت ئەگا لە چاكەو لە خراپە (لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ) هەر لە یەكەم ڕۆژ بۆ تۆ دیار كراوەو نادرێ بە یەكێكی تر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەبی هەموومان دەست بەكار بین، بۆ ئەوەی بگەینە ئەو شتەی بۆمان داندراوەو بە دانانی خوا ئەبی ڕازی بین، بۆ ئەوەی خوا لێمان ڕازی بێ.

(وَاعْلَمْ أَنَّ النَّصْرَ) بزانە: سەركەوتن لە هەموو كارێكا (مَعَ الصَّبْرِ) لەگەڵ خۆڕاگرتندا بە یەكەوه بەستراون (وَأَنَّ الْفَرَجَ) وه هەروەها دەرچوون لە ناخۆشی (مَعَ الْكَرْبِ) هەر لەگەڵ ناخۆشیدایەو بۆت ئەبێ (وَأَنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا) هەروەها هەموو كارێكی سەخت ئاسانیەكی لەگەڵدایەو ناخۆشی لا ئەبا.

كەوابوو: پێویستە موسوڵمان خۆڕاگر بێو ورەی بەرز بێ، چونكە بە خۆڕاگرتن خوای گەورە سەركەوتووی ئەكا، وە هەر ناخۆشیەكو سەختیەك هەیە لە دونیادا دەرگەی خۆشیی هەیەو بە خۆڕاگرتن بە خۆشی شاد ئەبێو ناخۆشیەكەی لە بیر ئەچێتەوە.

**ئینجا بزانە:** لەم فەرموودە پیرۆزەدا پێغەمبەرﷺ پێمان ڕائەگەیەنێ: كە پێویستە بەڕاستی بەندەی خوا بینو ملكەچی بۆ ئەمو ئەو نەكەین، چونكە ئەوانیش وەكو ئێمە بێدەسەڵاتن، كەوابوو: دەتوانین بڵێین: واتەی ئەم حەدیسە لەم ئایەتە پیرۆزەدا كۆ كراوەتەوە، كە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَحْتَسِبْ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾ واتە: هەر كەسێك لە خوا بترسێو بۆ كاروباری دونیا ڕێگای ستەمكاری نەگرێتە بەر، خوای گەورە لە گشت تەنگانەیەك دەربازی ئەكاو بە شێوەیەكی وا ڕزقی بۆ ئەنێرێ: كە هەر بە سەر دڵیدا نەهاتوە، وە هەركەسێك پشت بە خوا ببەستێو بەندایەتی بۆ كەسیتر نەكاو كاری خۆی هەر بە خوا بسپێرێ، خوای گەورەی بە تەنها بەسیەتیو ئەیگەیەنێتە ئامانجو مەبەستەكانی، بەڕاستی خوای گەورە بۆ هەموو شتێك كاتێكی داناوە، تا نەگاتە كاتی خۆی نایكا. كەوابوو: ئەی موسوڵمانی خۆشەویست گشت كاروباری خۆت بدە دەست خوداو بەگوێرەی توانات دەست بەكار بە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (احْفَظِ اللهَ): پاراستنیخوا: بە پاراستنی فەرمانەكانیخواو پاراستنی سنوری تاوانەكان ئەگوترێ، ئینجا بەم پاراستنە بەندە لەگەڵ خوا ئەكەوێتە مامەڵەكردنو لە جۆری كردەوەكانی پاداش لە خوا وەرئەگرێ، چونكە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُوا بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكُمْ﴾ واتە: پەیمانی من جێبەجێ بكەن، تاكو منیش پەیمانی ئێوە جێبەجێ بكەم.

٢- (لَمْ يَنْفَعُوكَ...لَمْ يَضُرُّوكَ): بێگومان: سودبەخشو زیانده‌ری ڕاستەقینە تەنها خوای گەورەیە، كەوابوو: هەركەسێك باوەڕی وابێ: كە-جگە لە خوا- سودبەخشو زیاندەرێكیتری ڕاستەقینە هەیە، ئەوە كافرە، چونكە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِنْ يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلاَ رَادَّ لِفَضْلِهِ﴾ واتە: ئەگەر خوا زیانێكت لێبدا كەس ناتوانێ لایبدا جگە لە خوا، وە ئەگەر بیەوێ سودێكت پێبگەیەنێ كەس ناتوانێ بیگەڕێنێتەوە. كەوابوو: بەندە تەنها دەسەڵاتی وەدەستهێنانی ئەو سودو زیانەی هەیە: كە خوا دروستی ئەكاو بڕیاری بۆ داوە.

## (اَلْحَدِيثُ الْعِشْرُون: فِي الْحَياء)

﴿عَنْ أَبِي مَسْعُود عُقْبَةَ بن عَمْروالأَنْصارِي الْبَدْرِيِّ: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسَ مِنْ كَلاَمِ النُّبُوَّةِ الأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ﴾ رواهُ الْبخاري.

---

٣- (رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ): دەربارەی بڕیاردانی (أزَلـي)و نووسینی پێش بوونەوەر، (صَحابَة) پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ کردو گوتیان: ﴿يارسول الله فَفِيمَ الْعَمَلُ الْيَوْمَ: أَفِيمَا جَفَّتْ بِهِ الأَقْلاَمُ وَجَرَتْ بِهِ الْمَقادِيرُ، أَمْ فِيما نَسْتَقْبِلُ؟ قالَ: لاَ، بَلْ فِيمَا جَفَّتْ بِهِ الأَقْلاَمُ وَجَرَتْ بِهِ الْمَقادِيرُ. قالَ: فَفِيمَ الْعَمَلُ؟ قالَ: إِعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ﴾ رواهُ مُسْلِم، ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەو کردەوانەی ئێمە ئەیکەین: ئایا لە (أزَل)دا بڕیاریان بۆ دراوەو نووسراوەو بڕاوەتەوە، یان لە دوای کردن ئەنووسرێ؟ فەرمووی: نا، بەڵکو لە (أزَل)دا بڕیار دراوەو نووسراوە. گوتی: ئەی بۆ چی دەست بەکار بین، بۆ پاڵ نەدەینەوە؟ فەرمووی: دەست بەکار بن چونکە هەر کەسە بۆ دروستکراوەکەی خۆی ئامادە ئەکرێو ڕێگای بۆ ئاسان ئەکرێ. واتە: ئەگەر بۆ بەختەوەری دروست کرابێ، کردەوەی بەختەوەریانەی بۆ ئاسان ئەکرێ، ئەگەر بۆ بەدبەختی دروست کرابێ، کردەوەی بەدبەختیانەی بۆ ئاسان ئەکرێ.

### ﴿حەدیسی بیستەم: دەربارەی شەرم کردن﴾

(عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ عُقْبَةَ بن عَمْروالأَنْصارِيِّ البَدْرِيِّ)ﷺ (عوقبە)ی کوڕی (عەمر)ی (ئەنساری)، سەحابەیەو یەکێکە لەو حەفتا کەسەی پەیمانی (عەقەبە)ی دووەمیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەستوە، لە ساڵی (٤١)ی کۆچی لە (مەدینە) وەفاتی کردوە، (١٠٢) حەدیسی گێڕاونەوە.

(قَالَ) ئەفەرموێ: (قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسَ) بە ڕاستی ئەوەی گەیشتۆتە خەڵك (مِنْ كَلاَمِ النُّبُوَّةِ الأُولَى) لە فەرموودەکانی پێغەمبەرانی پێشوو، ئەمەیە: (إِذَا لَمْ تَسْتَحِي) ئەگەر شەرم ناکەی (فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ) هەر چی حەز ئەکەی بیکە. چونکە شەرم کردن بەشێکە لە باوەڕ بە خواو بە پێغەمبەرﷺ، کە مرۆڤ شەرمی نەما باوەڕی لاواز ئەبێو کردەوەی ناشیرین ئەکا، شەرم کردن باشترین ڕەوشتی مرۆڤە، چونکە هەر چاکەی لێ‌پەیدا ئەبێ.

ئینجا شەرم کردن لە خوای گەورە باشترینو گەورەترین پلەی شەرمە، لە بەر ئەوەی لە خراپە ئەتپارێزێ (رواهُ الْبخاري) ئیمامی (بوخاری) گێڕاویەتیەوە.

**بزانە:** شەرم کردن لە پرسیارکردنی کاروباری ئایینیو فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە، لێرەدا مەبەست نیە؟ چونکە شەرم کردن لەو جۆرە شتە ترسنۆکیە، نەك شەرمنی.

## (اَلْحَدِيثُ الْحادي والْعشْرون: في الإيمان وَالإسْتقامَة)

﴿ عَنْ أَبِي‌عَمْرو وَقِيلَ أَبِي‌عَمْرَةَ سُفْيَانَ بن عَبْدِاللهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله قُلْ لِي فِي‌الإِسْلاَمِ قَوْلاً لاَ أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا غَيْرَكَ؟

---

### ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (اَلْحَياء): واتە: شەرم: گۆڕانێکە دێتە سەر دڵو ڕەنگی مرۆڤ لە ترسی ئاشکرابوونی نالەبارییێکی خۆی.

**ئینجا بزانە:** واجبە مرۆڤ زیاتر شەرم لە خوایخۆی بکا، بە جۆرێکی وا: ڕوو نەکاتە ئەو شوێنانەی خوا لێی قەدەغە کردوەو دوا نەکەوێ لەو شوێنانەی خوا فەرمانی پێکردوە.

پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إسْتَحْيُوا مِنَ الله حَقَّ الْحَياء. قالُوا: إنَّا نَسْتَحِي وَالْحَمْدُ لله. فَقالَ: لَيْسَ ذَلكَ، وَلَكِنِ الإسْتَحْياءُ مِنَ الله حَقَّ الْحَياء: أَنْ تَحْفَظَ الرَّأْسَ وَمَا وَعَى، وَالْبَطْنَ وَما حَوَى، وَأَنْ تَذْكُرَ الْمَوْتَ وَالْبِلَى، وَمَنْ أَرادَ الآخِرَةَ تَرَكَ زِينَةَ الدُّنْيا، فَمَنْ فَعَلَ ذَلكَ فَقَدْ إسْتَحْيا مِنَ الله حَقَّ الْحَياء﴾ رواهُ الترمذي وأحمد، شەرم لە خوا بکەن شەرمێکی بەڕاستی. (صَحابَة) گوتیان: ئێمە شەرم ئەکەین سوپاس بۆ خوا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: مەبەستم ئەو شەرمەی ئێوە نیە، بەڵکو شەرم کردن لە خوا بەڕاستی ئەوەیە: سەرت بپارێزی لەگەڵ ئەندامەکانی سەر: وەکو گوێو دەمو لوتو چاو، هەروەها زگت بپارێزی لەگەڵ حەزو بۆچوونەکانی: وەکو خواردنو عەوڕەت، باسی مردنو ڕزینی لاشەکەت بکە، هەرکەس ژیانی دواڕۆژی بوێ واز ئەهێنێ لە حەڕامەکانی دونیا، جا هەرکەس ڕەفتار بەم حەدیسە بکا بەڕاستی شەرم لە خوا ئەکا.

٢- (فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿اَلْحَياءُ مِنَ الإِيمانِ، وَالإِيمانُ فِي‌الْجَنَّةِ، وَالْبَذَاءُ مِنَ الْجَفاءِ وَالْجَفاءُ فِي‌النَّارِ﴾ رواهُ الترمذي، شەرم کردن بەشێکە لە ئیمان، خاوەن ئیمانیش جێگەی بەهەشتە، بێشەرمیو زمان پیسی بەشێکە لە دڵڕەقی، دڵڕەقیش جێگەی دۆزەخە.

### ﴿ حەدیسی بیستو یەکەم: باوەڕهێنانو بەردەوامبوون لە سەر باوەڕ ﴾

(عَنْ أَبِي‌عَمْرو وَقِيلَ أَبِي‌عَمْرَةَ سُفْيَانَ بْن عَبْدِ الله ﷺ) گێڕدراوەتەوە لە (سوفیان)ی کوڕی (عبدالله) خوا لێی ڕازی بێ، سەحابەیە، خەڵکی (طائف)ە، لەگەڵ نوێنەری (سەقیف) موسوڵمان بووە، (٥) حەدیسی گێڕاوەتەوە.

(قَالَ: قُلْتُ) ئەفەرموێ: گوتم (يَارَسُولَ اللهﷺ) ئەی پێغەمبەری‌خواﷺ (قُلْ لِي فِي‌الإِسْلاَمِ قَوْلاً) دەربارەی ئایینیئیسلام فەرموودەیەکم بۆ بڵێ کە (لاَ أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا غَيْرَكَ) ئەوەندە ئاشکرا بێ، پێویستم بە کەسیتر نەبێ لێی بپرسم؟

قَالَ ﷺ: قُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ ثُمَّ اسْتَقِمْ ﴾ رواهُ مُسْلِم.

(قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (قُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ) بڵێ: باوەڕی تەواوم هەیە بە خوا (ثُمَّ اسْتَقِمْ) ئینجا لە سەر ئەو ڕێگا ڕاستەی ئیسلام بڕۆو لێی لامەدەو بەردەوام بە (رواهُ مُسْلِم) ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

**ئینجا بزانە:** ئیمانی هیچ کەس ڕاست نابێ تا دڵی ڕاست ئەبێ، دڵیشی ڕاست نابێ تا زوبانی ڕاست ئەبێ. کەوابوو: بە دڵو بە زوبان باوەڕی تەواوت هەبێ: بەو شەش ڕوکنەی ئیمان، وە هەر پێنج ڕوکنەکانیئیسلام ئەنجام بدە، بەردەوام بە: لە سەر خواپەرستیو وازهێنان لە خراپە، ئینجا لە سەر ئەم ڕێگایە بڕۆو بە دوای ئەمو ئەو مەکەوە، چونکە لە ڕێگە لاتئەدەن.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (آمَنْتُ بِاللهِ): باوەڕ هەبوون بە تاكو تەنیایی خوا بە زمانو بە کردار، هەروەها بەردەوامبوونو لانەدان لەم بیروباوەڕە ئەبنە هۆی دۆستایەتی فریشتەو شادبوون بە بەهەشتی پانو بەرین، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلاَئِكَةُ أَلاَّ تَخَافُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ، نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ، نُزُلاً مِنْ غَفُورٍ رَحِيمٍ﴾، واتە: ئەوانەی ئەڵێن: خودامان (الله)یەو لە سەر ئەم بیروباوەڕە ئەمێننەوەو لانادەن، فریشتە دێنە لایان لە کاتی مردنو لە ناو قەبرو لە کاتی زیندووبوونەوەی قیامەت، پێیان ئەڵێن: مەترسێنو دڵتەنگ مەبن، موژدەتان ئەدەینێ: بەو بەهەشتەی وەعدەتان پێدرابو، ئێمە دۆستو یارمەتیدەری ئێوەین لە دونیاو لە قیامەت، لەو بەهەشتەدا ئەتاندرێتێ: هەرچی دڵتان حەزی لێبکاو ئێوە بیخوازن، میوانداریتان ئەکرێ لە لای خودایەك: کە داپۆشەری گوناهەکانەو میهرەبانە.

٢- (ثُمَّ اسْتَقِمْ): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ شِرَّةً وَلِكُلِّ شِرَّةٍ فَتْرَةً، فَإِنْ كَانَ صَاحِبُهَا سَدَّدَ وَقَارَبَ فَارْجُوهُ، وَإِنْ أُشِيرَ إِلَيْهِ بِالأَصَابِعِ فَلاَ تَعُدُّوهُ﴾ رواهُ الترمذي، واتە: هەموو شتێك توندو تۆڵیەکی هەیەو هەموو توندو تۆڵیەکیش خاوبوونەوەیەکی هەیە، جا ئەگەر مرۆڤی توندو تۆڵ لە کارەکانیدا ڕێگای ڕاستی گرتە بەر و مام ناوەنجی بوو، چاوەڕوانی چاکەی لێبکەن، ئەگەر بە پەنجە ئاماژەی بۆ ئەکرا و لە سنوور بەدەر زێدەڕۆیی کرد، بە هیچی دامەنێن. واتە: چونکە بەردەوام نابێ.

## (اَلْحَدِيثُ الثّانِي وَالْعِشْرُون: مَا يَكون سَبَباً لِدُخُولِ الْجَنَّة)

﴿عَنْ جَابِرِ بن عَبدالله الأنْصارِي رَضِيَ اللهُ عَنهما: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِﷺ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ إِذَا صَلَّيْتُ الْمَكْتُوبَات وَصُمْتُ رَمَضَانَ وَأَحْلَلْتُ الْحَلالَ وَحَرَّمْتُ الْحَرَامَ، وَلَمْ أَزِدْ عَلَى ذَلِكَ شَيْئًا، أَفَأَدْخُلُ الْجَنَّةَ؟ قَالَﷺ: نَعَمْ﴾ رواهُ مُسلِم، وَمَعْنَى حَرَّمْتُ الْحَرَامَ: إجْتَنَبْتُهُ، وَمَعْنَى أَحْلَلْتُ الْحَلالَ: فَعَلْتُهُ مُعْتَقداً حلَّهُ.

---

## ﴿ حەدیسی بیستو دووەم: ئەو شتەی ئەبێتە هۆی چوونە بەهەشت ﴾

(عَنْ جَابِرِ بنِ عبْدِالله الأنْصارِي رَضِيَ اللهُ عَنهما) گێڕدراوەتەوە لە (جابیر)ی کوڕی (عبدالله)ی (ئەنساری) خوا لێیان ڕازی بێ، خۆیو باوکی سەحابە بون، (جابیر) لە (مەدینە)ی پیرۆز لە دایك بووەو لە تەمەنی (٩٤) ساڵیدا لە (مەدینە) وەفاتی کردوە، (١٥٤٠) حەدیسی گێڕاونەوە.

(أنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ الله)ﷺ (جابیر) ئەفەرموێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کرد (فَقَالَ) پیاوەکە گوتی: (أَرَأَيْتَ) پێم بڵێ باوەڕت وایە: (إِذَا صَلَّيْتُ الْمَكْتُوبَاتِ) هەر کاتێك ئەم پێنج نوێژانەم کردن کە واجبن (وَصُمْتُ رَمَضَانَ) وە مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بوم (وَأَحْلَلْتُ الْحَلاَلَ) وە حەڵاڵم بە حەڵاڵ زانیو ئەوەی پێویست بوو کردم (وَحَرَّمْتُ الْحَرَامَ) وە حەرامم بە حەرام زانیو لێی دوور کەوتمەوەو نەمکرد (وَلَمْ أَزِدْ عَلَى ذَلِكَ شَيْئًا) جگە لە نوێژو ڕۆژووو خۆپاراستن لە حەرام، هیچیترم نەکرد لە خێرو چاکە (أَفَأَدْخُلُ الْجَنَّةَ؟) ئایا بە بێسزادان ئەچمە بەهەشت؟

(قَالَ: نَعَمْ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ. واتە: بە بێ سزادان ئەچیتە بەهەشت (رواهُ مُسلِم) ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

**ئاگاداری:** ئەگەر ئیمانداریك تاوانبار بێو خوا لێی خۆش نەبوبێ، لە دوای سزادان ئەچێتە بەهەشت. **جا بزانە:** ئەم پیاوە پرسیاری زەکاتو حەجی نەکرد، چونکە لەو کاتە واجب نەبوبون.

ئەوەش **بزانە**: هیچ کەس بە کردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشت، تەنها بە ڕەحمی خودا ئەچێتە بەهەشت، بەڵام کردەوەی چاك ئەبێتە هۆی ڕەحمی خواو، ئیمانیش مەرجە: بۆ چوونە بەهەشتو ئەبێتە هۆی نەمانەوەی یەکجاری لە دۆزەخ.

**هەروەها بزانە:** هیچ کەس لە سەر نەکردنی سوننەت سزا نادرێ، بەو مەرجەی بە چاوی سووكو بێنرخ تەماشای سوننەت نەکا، جا هەر چەند دروستە سوننەتەکان نەکرێن، ئەتۆ هەر بیکەو وازی لێمەهێنە بۆ ئەوەی ببیە خۆشەویستی خوا. هەروەك لە حەدیسی (٣٨) بە درێژی باسی ئەکەین، إنْ شاءالله تَعالى.

..................................

**ئینجا بزانە:** لەم حەدیسەدا تەواوی تێکۆشان لە دژی شەیتان کۆ کراوەتەوە، چونکە ئەگەر مرۆڤ خوا بپەرستێو نزیک حەرام نەکەوێ، ئەبێتە دوژمنی شەیتانو لە بەهەشت نزیک ئەبێتەوە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: قالَ النَّبيُّ ﷺ: حُجبَت النَّارُ بالشَّهَوات وَحُجبَت الْجَنَّةُ بالْمَكاره﴾ رواهُ الشيخان، دۆزەخ بە دۆستایەتی نەفسو شەیتان داپۆشراوە، بەهەشت بە دژایەتی نەفسو شەیتان داپۆشراوە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (أَحْلَلْتُ الْحَلاَلَ وَحَرَّمْتُ الْحَرَامَ): بە هۆی حەرامو حەلاڵ مرۆڤی موسوڵمان لە دونیادا هەردەم لە تاقیکردنەوەدایە، ئایا ئایینەکەی زاڵ ئەبێ بە سەر حەرامدا، یان نا؟ پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿إنَّ الدُّنْيا حُلْوَةٌ خَضرَةٌ، وَإنَّ اللهَ مُسْتَخْلفُكُمْ فيها فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُونَ؟ فَاتَّقُوا الدُّنْيا وَاتَّقُوا النِّساءَ فَإنَّ أَوَّلَ فتْنَة بَني إسْرائيلَ كَانَتْ في النِّساء﴾ رواهُ مُسْلم، واتە: ئەم دونیایە شیرینو سەوزە دڵ بۆی ئەچێ، خوای گەورە ئێوەی لە دونیا داناوەو تەماشاتان ئەکا چی ئەکەن؟ لە دونیا بترسێنو لە ئافرەتان بترسێن، نەوەکو بە هۆی دونیاو ئافرەتان تووشی حەرام ببن، چونکە یەکەم بێشەرعیو ئاژاوەی (بَني إسرائيل) بە هۆی ئافرەتان پەیدا بووە.

٢- (وَحَرَّمْتُ الْحَرَامَ): بە هۆی خۆپاراستن لە حەرام، مرۆڤ بەردەوام لە ئازاردایەو بە هۆی ئەم ئازارە خوا پاداشتی ئەداتەوە، جا لە بەر ئەم ئازارە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿الدُّنْيا سجْنُ الْمُؤْمنِ وَجَنَّةُ الْكافرِ﴾ رواهُ مُسْلم، دونیا بەندیخانەی موسوڵمانەو بەهەشتی کافرە. واتە: چونکە موسوڵمان لە دونیا قەدەغە کراوە لە حەرام، ئەم دونیایە بە نیسبەت ئەو بەهەشتەی بۆی داندراوە وەکو بەندیخانەیە، هەروەها چونکە کافر لە دونیا بەرەڵڵایەو قەدەغەی خوا ئەشکێنێ، ئەم دونیایە بە نیسبەت ئەو دۆزەخەی بۆی داندراوە وەکو بەهەشتە.

٣- (أَدْخُلُ الْجَنَّةَ؟ قالَ: نَعَمْ): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿سَدِّدُوا وَقارِبُوا وَأَبْشرُوا فَإنَّهُ لَنْ يُدْخلَ الْجَنَّةَ أَحَداً عَمَلُهُ. قالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ الله؟ قالَ: وَلاَ أَنا، إلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنيَ اللهُ منْهُ برَحْمَة، وَاعْلَمُوا أَنَّ أَحَبَّ الْعَمَلِ إلَى الله أَدْوَمُهُ وَإنْ قَلَّ﴾ رواهُ الشيخان، واتە: ڕێگای ڕاست بگرنە بەر لە کردەوەکانتان، ئەگەر بە تەواویش نەتانکردن نزیکی بکەنەوە، موژدە وەربگرن کە خوا پاداشتان ئەداتەوە، بە ڕاستی کردەوەی هیچ کەسێك نایباتە بەهەشت. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردەوەی تۆش ناتباتە بەهەشت؟ فەرمووی: کردەوەی منیش نامباتە بەهەشت، مەگەر خوا بە ڕەحمەتیخۆی دامبپۆشێ، بزانن: خۆشەویسترین کردەوە لە لای خوا، کردەوەی بەردەوامە هەرچەند کەمیش بێ.

## ( اَلْحَدِيثُ الثّالث والْعشْرُون: مَجْمُوعَةٌ مِنَ الْحَسَنات )

﴿ عَنْ أَبِيمالكِ الْحارث ابْن عاصِم الأَشْعَرِيﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهﷺ: اَلطُّهُورُ شَطْرُ الإِيْمَان، وَالْحَمْدُ للّه تَمْلأُ المِيزَانَ، وَسُبْحَانَ الله وَالْحَمْدُ للّه تَمْلآن أَوْ تَمْلأُ مَا بَيْنَ السَّمَاوَات وَالأَرْضِ، وَالصَّلاَةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ،

---

### ﴿ حەدیسی بیست‌وسێیەم: کۆمەڵێك لە چاکەکان ﴾

(عَنْ أَبِيمالِكِ الْحارِثِ ابْن عاصِمِ الأَشْعَرِيﷺ) گێڕدراوەتەوە لە (ئەبومالیك)ی (ئەشعەری) خوا لێی ڕازی بێ، سەحابەیەو خەڵکی (یەمەنە)، هاتۆتە (مەدینە) لە خزمەت پێغەمبەرﷺ موسوڵمان بووە، (٢٧) حەدیسی گێڕاونەوە، لە ساڵی (١٨)ی کۆچی وەفاتی کردوە.

(قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهﷺ) ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی (اَلطُّهُورُ) پاك ڕاگرتنی لەش‌و بەرگ‌و شوێن‌و ناو دڵ (شَطْرُ الإِيمَانِ) نیوەی ئیمانە. واتە: پاك‌و خاوێنی نیوەی باوەڕە، لە هەمووش گرنگتر دەستنوێژو خۆ شوشتنە لە لەش پیسی.

(وَالْحَمْدُ لِلّه) ووتنی (اَلْحَمْدُ لِلّه) خێری ئەوەندە زۆرە: (تَمْلأُ الْمِيزَانَ) تەرازووی ڕۆژی قیامەت پڕ دەکا.

**بزانە:** لە ڕۆژی قیامەت بۆ هەموو کەس تەرازوو دائەندرێ‌و چاکەو خراپەی پێ‌ئەکێشرێ، چاکە لە لایەك، خراپە لە لایەك، جا هەرکەس چاکەی گرانتر بوو بەختەوەر ئەبێ، وە ئەگەر چاکەی سوکتر بوو بەدبەخت ئەبێ، کەوابوو: زۆر زیکری خوا بکە، بۆ ئەوەی چاکەت گرانتر بێ‌و بەختەوەر ببی.

(وَ) هەروەها ووتنی (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلّه) بە یەکەوە، خێری ئەوەندە زۆرە: (تَمْلآنِ أَوْ تَمْلأُ مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ) نێوان ئاسمانەکان‌و زەمین پڕ ئەکەن، لە پاش پڕکردنی تەرازوو.

**ئینجا بزانە:** تەرازوو گەورەترە لە نێوان ئاسمان‌و زەمین، وە خێری (اَلْحَمْدُ لِلّه) زۆرترە لە (سُبْحَانَ اللهِ)، وە ئەگەر بڵێی: (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ وَلاَإِلَهَ إِلاَّالله وَاللهُ أَكْبَرُ)، ئەوە خێری پڕ ئاسمان‌و زەمین‌و نێوان هەردووکیان‌و پڕ بە تەرازووە، هەروەك لە چەند حەدیسی‌تردا هاتوە، بەڵام زیکری (لاَإِلَهَ إِلاَّالله) لە هەموویان خێرترە، هەروەها (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ باللهِ) گەنجینەیەکی بەهەشتەو لە دەست خۆتی مەدە.

(وَالصَّلاَةُ نُورٌ) نوێژکردنی تەواو ڕووناکی‌یە بۆ ناو گۆڕی تاریك‌و ڕۆژی قیامەت، هەروەها ڕووناکی‌یە بۆ ناو دەروونی مرۆڤ، چونکە قەدەغەی ئەکا لە خراپە (وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ) زەکاتدان‌و خێرکردن بەڵگەیە لە سەر باوەڕی خاوەنەکەی لە دونیاو قیامەت.

(وَالصَّبْرُ) ئارام‌و خۆڕاگرتن: لە سەر خراپە نەکردن‌و لە سەر خواپەرستی‌و لە سەر ناخۆشیەکانی دونیا (ضِيَاءٌ) ڕۆشنایی دڵ‌و دەروونە.

وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو: فَبَائِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا﴾ رواهُ مُسْلِم.

**بزانه:** مرۆڤی خۆڕاگر لە سەر نەكردنی خراپە تۆ سەد پلەی چاكەی بۆ ئەنووسرێ، خۆڕاگر لە سەر خواپەرستی شەش سەد پلەی بۆ ئەنووسرێ، خۆراگر لە ناخۆشیەكانی دونیا سێ سەد پلەی بۆ ئەنووسرێ.

(وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ) قورئانی پیرۆز: یان شاهیدە بۆ تۆ -لە ڕۆژی قیامەت- ئەگەر ڕەفتارت پێكردبێ‌و بۆ خوا بیخوێنی، یان شاهیدە لە دژی تۆ -لە ڕۆژی قیامەت- ئەگەر ڕەفتارت پێ نەكردبێ‌و بۆ خوا نەتخوێندبێ.

(كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو) هەموو كەسێك كە ڕۆژ داهات بە كارێكەوە خەریك دەبێ: (فَبَائِعٌ نَفْسَهُ) جا ئێوا هەیە خۆی ئەفرۆشێتە خوای گەورەو هەر چاكە ئەكاو خراپە ناكا (فَمُعْتِقُهَا) ئەم جۆرە كەسە خۆی ئازاد ئەكا لە دۆزەخ (أَوْ مُوبِقُهَا) یان خۆی بە شەیتان ئەفرۆشێ‌و خراپە ئەكاو ماڵوێران ئەبێ لە قیامەت (رواهُ مُسْلِم) ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ): **بزانه:** پاك‌و خاوێنی ڕەوشتێكی زۆر گرنگە، چونكە ڕەوشتی گشت پێغەمبەرانە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِمْ أَجْمَعِين.

**ئینجا بزانه:** لە هەموو ڕەوشتەكان گرنگتر ئەم ڕەوشتانەن: كە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَإِسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ، وَقَصُّ الأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الإِبِطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ، قَالَ الرَّاوِي: وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ﴾ رواهُ مُسْلِم، دە ڕەوشت هەنە ڕەوشتی ئایینی خودانە، سمێڵ برینەوە بە مەقەست، ریش بەردان، سیواك كردن، پاككردنەوەی كونە لووت، نینۆك كردن، شووشتنی لۆچی پەنجەكان، هەڵكەندنی مووی بن هەنگڵ، تاشینی بەر، تارەت كردن، شووشتنی دەم، یان سوننەتكردنی ئامێری پیاو و ئافرەت.

٢- (وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ): ڕەفتاركردن بە قورئانی پیرۆز ئەبێتە هۆی سەربەرزی‌دونیاو بەختەوەری‌قیامەت؟ چونكە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلاَ يَضِلُّ وَلاَ يَشْقَى﴾ واتە: هەركەسێك شوێن ئەم قورئانە بكەوێ، لە دونیادا گومڕا نابێ‌و لە قیامەتیشدا بەدبەخت نابێ.

٣- (أَوْ عَلَيْكَ): بەدبەختی‌و ڕووڕەشی بۆ كەسێكە: كە ڕەفتار بە قورئانی پیرۆز ناكاو بە بەرنامەی ژیانی نازانێ‌و وازی لێدێنێ‌و شوێن بەرنامەی دەستكرد ئەكەوێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى، قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا

( اَلْحَدِيثُ الرَّابِع والْعِشْرون: إسْتِغْنَاءُ اللهِ عَنِ الْغَيْرِ )

﴿عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغِفارِي رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فِيمَا يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ تَعَالَى، أَنَّهُ قَالَ: يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فَلاَ تَظَالَمُوا، يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ

---

فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى﴾ واته: هەر كەسێك واز لە قورئانەكەی من بێنێ‌و ڕەفتاری پێ‌نەكاو بە بەرنامەی ژیانی تێ‌نەگا، ئەوە ژیانێكی سەختو بەدبەختانەی ئەدرێتێ‌و بە دڵنیایی‌و چاوتێری نازیێ، لە ڕۆژی قیامەتیش بە كوێری حەشری ئەكرێ‌و ئەڵێ: خوایە بۆچی بە كوێری حەشرت كردم خۆ من لە دونیادا چاوم هەبوو؟ خوا ئەفەرموێ: وەها قورئانەكەی منت لە دونیا بۆ هاتو خۆت لێ كوێر كردو ڕەفتارت پێ‌نەكرد، وەهاش ئێمە لە ناو دۆزەخدا ئەتهێڵینەوەو هیچ نرخێكت بۆ دانانێین.

٤- (فَمُعْتِقُهَا، أَوْ مُوبِقُهَا): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿كُلُّ كَلاَمِ ابْنِ آدَمَ عَلَيْهِ لاَ لَهُ، إِلاَّ أَمْرٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ نَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ أَوْ ذِكْرُ اللهِ تَعالَى﴾ رواهُ الترمذي، گشت گوفتارەكانی ئادەمیزاد لە دژی خۆیەتی‌و سودی لێوەرناگرێ، جگە لە فەرمان بە چاكەو قەدەغەكردنی خراپەو زیكری خوای گەورە. كەوابوو: لە سەر ئەم سێ ڕەوشتە بەردەوام بە، تاكو خۆت ئازاد بكەی لە ماڵوێرانی‌ی دونیاو قیامەت.

﴿ حەدیسی بیستو چوارەم: خوا پێویستی بە هیچ شتێك نیە ﴾

(عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغِفَارِي رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فِيمَا يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ تَعَالَى) گێڕدراوەتەوە لە (ئەبو زەڕڕ)ی (غیفاری) خوا لێی ڕازی بێ، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ ئەگێڕێتەوە، پێغەمبەریش ﷺ لە خوای گەورە ئەگێڕێتەوە.

( **پێناسە** ) **بزانە:** بەم جۆرە حەدیسانە ئەگوترێ: (حەدیسی قودسی) واتە: حەدیسەكە ووشەو مانای لە لای خواوە هاتوە، بەڵام ناگاتە پلەی قورئان، وە حەدیسەكانی‌تری پێغەمبەر ﷺ مانای لە لای خواوە هاتوەو ووشەكەی هی پێغەمبەرە ﷺ.

(أَنَّهُ قَالَ) خوای گەورە فەرمووی: (يَا عِبَادِي) ئەی بەندەكانی من (إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي) من ستەمو زۆرداریم لە سەر خۆم حەرام كردوەو نایكەم (وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا) هەروەها ستەمو زۆرداری لە نێوان ئێوەشدا حەرامم كردوەو (فَلاَ تَظَالَمُوا) كەواتە: ئێوەش ستەمو زۆرداری لە یەكتری مەكەن: وە ستەم لە خۆشتان مەكەن بە تاوان كردن.

**بزانە:** ستەمو زۆرداری: دەستدرێژی‌كردنە بۆ سەر مافی كەسێكی‌تر بە ناهەق‌و دوژمنایەتی، یان دەرچوونە لە سنوری خوا.

(يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ ضَالٌّ) ئەی بەندەكانم ئێوە هەمووتان سەرلێشێواون‌و نەشارەزان لە ئایینی‌ئیسلام (إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ) تەنها ئەو كەسە نەبێ: كە من بیخەمە سەر ڕێگای ڕاست

فَاسْتَهْدُونِى أَهْدِكُمْ، يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ فَاسْتَطْعِمُونِى أُطْعِمْكُمْ، يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ فَاسْتَكْسُونِى أَكْسُكُمْ، يَا عِبَادِى إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا فَاسْتَغْفِرُونِى أَغْفِرْ لَكُمْ، يَا عِبَادِى إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضُرِّى فَتَضُرُّونِى وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِى فَتَنْفَعُونِى،

---

(فَاسْتَهْدُونِى) کەواتە: ڕێگای ڕاست هەر لە من داوا بکەن (أَهْدِكُمْ) منیش شارەزای ڕێگای ڕاستتان ئەکەمو ئەتانخەمە سەر ڕێگای ڕاست.

ئەی موسوڵمان، تەنها ڕێگای خواو پێغەمبەرﷺ بگرەو بە دوای ڕێچکەکان مەکەوە؟ چونکە گومڕات ئەکەن، جگە لە خوا کەس ناتوانێ بتگەینێتە ڕێگای ڕاست، ئەوانەی تۆ دوایان ئەکەوی، وەکو تۆ سەر لێشێواون ئەگەر ڕێگای خواو پێغەمبەرﷺ نەگرن.

(يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ جَائِعٌ) ئەی بەندەکانم ئێوە هەمووتان برسین (إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ) تەنها ئەوانە نەبێ: کە من خواردنو خواردنەوەیان ئەدەمێ (فَاسْتَطْعِمُونِى) داوای خواردەمەنی هەر لە من بکەن (أُطْعِمْكُمْ) منیش ئەتاندەمێ، واتە: ڕێگای وەدەستهێنانی خواردنتان بۆ ئاسان ئەکەم.

ئەی موسوڵمانی برسیو هەژار: با هاوارت هەر بۆ قاپی خودا بێ، چونکە هەر کەسێکیتر –جگە لە خودا– داوای خواردنی لێبکەی، ئەویش وەکو تۆ پێویستی بە خودایە.

(يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ عَارٍ) ئەی بەندەکانم ئێوە هەمووتان ڕووتن (إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ) تەنها ئەو کەسە نەبێ کە من بەرگی بکەم (فَاسْتَكْسُونِى) داوای بەرگ هەر لە من بکەن (أَكْسُكُمْ) منیش بەرگتان ئەدەمێ، واتە: ڕێگای وەدەستهێنانی بەرگو پۆشاکتان بۆ ئاسان ئەکەم.

(يَا عِبَادِى) ئەی بەندەکانم (إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ) ئێوە بە شەو و ڕۆژ گوناه ئەکەن (وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا) من ئەگەر حەز بکەم لە هەموو گوناهێك خۆش ئەبم جگە لە کافربوون (فَاسْتَغْفِرُونِى) داوای لێخۆشبوونی گوناه هەر لە من بکەن (أَغْفِرْ لَكُمْ) منیش لێتان خۆش ئەبم.

پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿كُلُّ بَنِى آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ﴾ رواهُ الترمذی، هەموو ئادەمیزادان گوناهبارن، وە باشترینی گوناهباران تۆبەکارانن.

کەوابوو: ئەی موسوڵمان زوو تۆبە بکەو باری گوناه لە سەر خۆت لادە، بە دڵو زوبان (أَسْتَغْفِرُ اللهَ) بکە، واتە: داوای لێخۆشبوونی گوناهم لە خودا ئەکەم. بۆ ئەوەی خوا لێت خۆش بێو ڕزقت فراوان بکاو غەمت لاببا.

(يَا عِبَادِى إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضُرِّى فَتَضُرُّونِى) ئێوە ناگەنە ئەو ڕادەیە کە بتوانن زیان لە من بدەن (وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِى فَتَنْفَعُونِى) هەروەها: ناشگەنە ئەو پلەیە کە بتوانن سودم پێبگەیەنن، واتە: ئەو چاکانەی خودا لەگەڵ بەندەکانی خۆی ئەکا، لە ترسی زیان لێدانی

يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا زَادَ ذَلِكَ فِى مُلْكِى شَيْئًا، يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِى شَيْئًا، يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ قَامُوا فِى صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِى فَأَعْطَيْتُ كُلَّ وَاحِدٍ مَسْأَلَتَهُ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِى إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ، يَا عِبَادِى إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا:

---

خۆی نیەو بۆ سود پێگەیاندنی خۆیشی نیە، بەڵکو بۆ قازانجی ئەوانە، چونکە زۆر لەگەڵیان بە ڕەحمە.

(يَا عِبَادِي) ئەی بەندەکانم (لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ) ئەگەر لە یەکەم کەستانەوە تا دواییینتان (وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ) بە ئادەمیزادتانەوەو بە جنۆکەتانەوە (كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ) هەمووتان بێنە سەر دڵی چاکترین مرۆڤ لە ئێوە، واتە: ببنە مرۆڤێکی لەخواترس (مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا) ئەوە هیچ لە گەورەییو دەسەڵاتی من زۆرتر ناکا، وە سودی خواپەرستی بۆ خۆتانە.

(يَا عِبَادِي) ئەی بەندەکانم (لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ) ئەگەر لە یەکەم کەستان تا دواییینتان (وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ) بە ئادەمیزادو جنۆکەتانەوە (كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ) هەموویان بێنە سەر دڵی خراپترین مرۆڤ لە ئێوە، واتە: هەموو ببنە پیاوی خراپ (مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا) ئەوەش هیچ لە گەورەییو دەسەڵاتی من کەم ناکاتەوە، واتە: ئێوە خوا بپەرستن، یان نەیپەرستن، بۆ خوایەتی خوا هەروەك یەکە.

(يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ) ئەی بەندەکانم ئەگەر لە یەکەم کەستانەوە تا دواییین کەستان، بە ئادەمیزادو جنۆکەوە (قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ) لە دەشتێکدا کۆ ببنەوە (فَسَأَلُونِي) هەر کەسە داوای شتێکم لێبکا (فَأَعْطَيْتُ كُلَّ وَاحِدٍ مَسْأَلَتَهُ) هەر یەکە لەو هەموو خەڵکە داواکراوەکەی خۆی بدەمێ (مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي) ئەوە هیچ لە گەنجینەی لای خۆم کەم ناکاتەوە (إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ) تەنها وەك دەرزی چەند کەم ئەکاتەوە (إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ) ئەگەر لە ناو دەریای هەڵێنی، واتە: بە دەرزی ئاوی دەریا کەم نابێتەوەو گەنجینەی خوداش کەم نابێتەوە.

(يَا عِبَادِي) ئەی بەندەکانم (إِنَّمَا هِيَ) ئەو کردەوە چاکانەو خراپانە (أَعْمَالُكُمْ) کردەوەی خۆتانە (أُحْصِيهَا لَكُمْ) من فەرمانم داوەتە فریشتەکانم: سەرژمێری کردەوەکانتان بکەن (ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا) ئینجا لە ڕۆژی دواییدا دەیدەمەوە دەستتانو پاداشو سزاتان ئەدەم بەگوێرەی کردەوەکانتان:

فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِاللهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إلاَّ نَفْسَهُ﴾ رواهُ مُسْلِم.

(فَمَنْ وَجدَ خَيْرًا) جا هەرکەسێك بینی لە ڕۆژی دوایی چاکەی هەیەو پاداشی چاکەی دراوە (فَلْيَحْمَدِ اللهَ) با سوپاسی خوا بکا کە یارمەتی داوە بۆ چاکە کردن (وَمَنْ وَجدَ غَيْرَ ذَلِكَ) وە هەر کەسێك بینی بە پێچەوانەوە خراپەی هەبوو و سزای خراپەی درا (فَلاَ يَلُومَنَّ إلاَّ نَفْسَهُ) ئەوە با هەر خۆی بە تاوانبار دابنێو لۆمەی کەسیتر نەکا، چونکە بەخۆی لە ڕێگای خوای گەورە لایداوە (رواهُ مُسْلِم) ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

**بزانە:** هەرچی ئیماندار بێو چاکەی هەبێ، ئەوە لە دونیاو قیامەت پاداشتی چاکەکانی ئەدرێتێ، بەڵام هەر کەسێك کافر بێ، ئەوە پاداشتی چاکەکانی هەر لە دونیا ئەدرێتێو بۆ قیامەت چاکەی نامێنێو بە هۆی خراپەکانی ئەچێتە دۆزەخ، لە هەموو خراپەکانی گەورەتر کافربوونە.

**پێناسە:** جنۆکە چینێکن خوا لە ئاگر دروستی کردون، وە بە هەموو وێنەیەك خۆیان ئەنوێنن، لە سەر وێنەی تایبەتیخۆیان کەس بە چاو نایانبینێ، ئەوان ئێمە ئەبینن، ژنو منداڵیان هەیەو کافرو موسوڵمانیان هەیە، شەیتان لە جنۆکە کافرەکانە.

**ئینجا بزانە:** خوای گەورە لەم حەدیسەدا هەڕەشەی کردوەو موژدەشی داوە، کەوابوو: هەرکەسێك بیەوێ لە هەڕەشەی خوا ڕزگاری بێو بگاتە موژدەی خوا، هیچ کەمتەرخەمی ناکا لە خواپەرستی ﴿عَنْ أبىهُرَيْرَةَ رضي الله عنه: عَنِ النَّبيِّ ﷺ: مَنْ خافَ أدْلَجَ وَمَنْ أدْلَجَ بَلَغَ الْمَنْزِلَ ألاَ إنَّ سلْعَةَاللهِ غالِيَةٌ ألاَ إنَّ سلْعَةَاللهِ الْجَنَّةُ﴾ رواهُ الترمذي، واتە: هەر کەسێك ترسی هەبێ شەوڕۆیی ئەکا، هەرکەسێك شەوڕۆیی بکا ئەگاتە شوێنەکەیخۆیو ئەحەسێتەوە، ئاگاداربن: کوتاڵی خوا زۆر بە نرخە، ئاگاداربن کوتاڵی خوا بەهەشتە. واتە: بە هەرزان نایفرۆشێ.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١-(فَلاَ تَظَالَمُوا): بۆ پاراستنی ئاینو گیانو نەژادو ناموسو هۆشو ماڵ، خوای گەورە (ظُلْم)ی حەڕام کردوە، واتە: دەستدرێژکردنە سەر ئەم شەشانە.

کەوابوو: گەورەترین ستەم کافربوونە، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ بە ڕاستی کافربوون ستەمێکی زۆر گەورەیە.

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لأَحَد منْ عرْضه أوْ شَيْء فَلْيَتَحَلَّلْهُ منْهُ الْيَوْمَ قَبْلَ أنْ لاَ يَكُونَ دينَارٌ وَلاَ درْهَمٌ: إنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالحٌ أُخذَ منْهُ بقَدْر مَظْلَمَته، وَإنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخذَ منْ سَيِّئَات صَاحبه فَحُملَ عَلَيْه﴾ رواهُ البخاري، واتە: هەر کەسێك (ظُلْم)ی لە کەسێك کردوە: دەربارەی ناموس، یان شتێکیتر، با لە دونیا گەردەنی خۆی پێ ئازاد بکا، پێش ئەوەی ڕۆژێك دابێ دیرهەمو دینار سودی نەبێ: لە ڕۆژی دوایی

---

ئەگەر ستەمكارەكە چاكەی هەبێ، ئەوە بە ئەندازەی ستەمەكەی چاكەی لێوەرئەگیرێو ئەدرێتەوە ستەملێكراوەكە، ئەگەر چاكەی نەبو، ئەوە خراپەكانی ستەملێكراوەكە وەرئەگیرێو ئەخرێتە سەر ستەمكارەكە، واتە: بە هۆی خراپەكانی خۆیو خراپەكانی ستەملێكراوەكە لە دۆزەخ سزا ئەدرێ.

٢- (فَاسْتَغْفِرُونِي): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ لَزِمَ الإِسْتِغْفَارَ جَعَلَ اللهُ لَهُ مِنْ كُلِّ ضِيقٍ مَخْرَجًا وَمِنْ كُلِّ هَمٍّ فَرَجًا وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَحْتَسِبُ﴾ رواهُ أبوداود، هەر كەسێك زۆر بڵێ: (أَسْتَغْفِرُاللهَ). خوای گەورە لە هەموو تەنگانەیەك دەربازی ئەكاو لە هەموو دڵتەنگیەك دڵخۆشی ئەكاو بە شێوەیەكی وا ڕزقی ئەداتێ: كە هەر بە خەیاڵیدا نایێ.

٣- (ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا): **بزانە:** كردەوەی چاك ئەبێتە هۆی بەختەوەری لە دونیاو قیامەت، هەروەكو خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ هەر كەسێك كردەوەی چاك بكا- پیاو بێ، یان ئافرەت- ئیمانداریش بێ، ژیانێكی خۆشی ئەدەینێ لە دونیا: بە ڕزقێكی حەڵاڵو ڕازیبوون بە دانانی خوا هەر چەند هەژاریش بێ، وە لە ڕۆژی قیامەتیش باشترینو جوانترین پاداشی چاكەكانیان ئەدەینەوە. كەوابوو: كافر بە پێچەوانەی موسوڵمانە لە دونیاو لە قیامەت.

## ﴿ حەدیسی بیستو پێنجەم: جۆری چاكە كردن زۆرن ﴾

(عَنْ أَبيِ ذَرٍّ الغفَاري) رضي الله عنه (ئەبو زەڕڕی غیفاری) خوا لێی ڕازی بێ ئەفەرموێ: (أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ) چەند كەسێك لە یارەكانی پێغەمبەر ﷺ:

(**پێناسە**) سەحابە، واتە: یارەكانی پێغەمبەر ﷺ، ئەو كەسانەن: كە بە موسوڵمانی پێغەمبەریان دیتبێ، یان پێغەمبەر ﷺ ئەوانی دیتبێ، بە موسوڵمانیش مردبن. **جا بزانە:** كە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی كرد، (١١٤٠٠٠)سەدوچواردە هەزار سەحابەی لە دوا بەجێمان.

(قَالُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ) سەحابەكان بە پێغەمبەریان گوت: (يَا رَسُولَ اللهِ، ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالأُجُورِ) ئەی پێغەمبەری خوا دەوڵەمەندەكان هەموو پاداشی گەورەیان وەدەست هێناوە لە دونیاو قیامەت: (يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي) هەروەك ئێمە نوێژ ئەكەین، ئەوانیش نوێژ ئەكەن (وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ) وەكو ئێمە بە ڕۆژوو ئەبن (وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُولِ أَمْوَالِهِمْ) جگە لە نوێژو ڕۆژوو، ماڵی زیادیان هەیە ئەیكەنە خێر لە ڕێگای خوا، ئێمە ماڵی زیادمان نیە؟

قَالَ ﷺ: أَوَلَيْسَ قَدْ جَعَلَ اللهُ لَكُمْ مَا تَصَّدَّقُونَ؟ إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً وَبِكُلِّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةً وَكُلِّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةً، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ، وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟! قَالَ ﷺ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أَكَانَ عَلَيْهِ وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ كَانَ لَهُ أَجْرٌ ﴾ رواهُ مُسْلِم.

---

(قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَوَ لَيْسَ) چۆن وا دەڵێن؟ (قَدْ جَعَلَ اللهُ لَكُمْ مَا تَصَّدَّقُونَ) وا مەڵێن، چونکە خوای گەورە ڕێگای زۆری بۆ ئێوە داناوە خێری پێبکەن:

(إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً) هەر جارێك بڵێن: (سُبْحَانَ اللهِ). خێرێکتان بۆ ئەنووسرێ (وَبِكُلِّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةً) هەر جارێك بڵێن: (اللهُ أَكْبَرُ). خێرێکتان بۆ ئەنووسرێ (وَكُلِّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةً) هەروەها (الْحَمْدُ لله) بگوترێ خێرێکی هەیە (وَكُلِّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةً) هەر جارێك (لَاإِلَـهَ إِلَّااللهُ) بگوترێ خێرێکی هەیە.

ئەی موسوڵمانی خۆشەویست: لە دوای هەر پێنج نوێژەکان ئەم زیکرانە لە دەست خۆت مەدە، کەوابوو: لە دوای نوێژ لە سەر فەرمانیپێغەمبەر ﷺ سیوسێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ). سیوسێ جار بڵێ: (الْحَمْدُ لله). سیوسێ جار بڵێ: (اللهُ أَكْبَرُ). یەك جار بڵێ: (لَاإِلَـهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير). دە جار بڵێ: (لَاإِلَـهَ إِلَّا اللهُ). پێغەمبەر ﷺ ئەوها ژمارەی بۆ داناوە، نەکەی لەخۆتەوە زیادو کەمی بکەی.

(وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ) هەر فەرمانکردنێك بە چاکە، خێرێکی هەیە (وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ) هەر قەدەغەکردنێکی خراپە بە هەر جۆرێك بێ خێرێکی هەیە.

(وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ) بە جیماع کردنو ڕابواردن لەگەڵ ژنی خۆتان خێرێکتان دەست ئەکەوێ (قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ) یارەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ) چۆن ئەگەر یەکێك لە ئێمە بۆ تێرکردنی ئارەزووی خۆی ئەو ئیشە لەگەڵ ژنی خۆی بکا (وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ) خێری ئەگاتیو پاداشی ئەدرێتەوە؟ (قَالَ: أَرَأَيْتُمْ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێم بڵێن (لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ) ئەگەر ئارەزووی خۆی بە حەرام تێر بکاو لەگەڵ ژنێکی ناحەلاڵ ڕابوێرێ (أَكَانَ عَلَيْهِ وِزْرٌ) ئایا گوناهی لە سەر ئەنووسرێ؟ بەڵێ: گوناهی لە سەر ئەنووسرێ (فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ) کەوابوو: هەروەها ئەگەر بە کاری بێنێ بۆ حەلاڵ (كَانَ لَهُ أَجْرٌ) خێری ئەگاتیو پاداشی هەیە (رواهُ مُسْلِم) ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

کەوابوو: ژن هێنانتو جیماعت، ئەویش هەر بە نیازی خودا بێ: وەك داوێن پاکیو زۆرکردنی نەتەوەی ئیسلامو پێکهێنانی خێزانێکی ئیسلامیو سودبەخش بۆ کۆمەڵی ئیسلام.

**ئینجا بزانە:** زۆر جۆریتری چاکە هەنە مرۆڤ هەستیان پێناکا، بەڵام ئەگەر نیازی ناو دڵی بۆ خوا بێ، خوا خێری بۆ ئەنووسێ:

**بۆ نموونە:** ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْرًا فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي بَلَغَ بِي. فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ فَسَقَى الْكَلْبَ فَشَكَرَ اللهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ، وَإِنَّ لَنَا فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ أَجْرًا؟ فَقَالَ: نَعَمْ فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ﴾ رواهُ الشيخان، واتە: لە کاتێکا پیاوێك بە ڕێگایەکدا ئەڕۆیشتو تێنووەتی تووش بوو، ئینجا بیرێکی دۆزیەوەو چووە ناویو ئاوی خواردەوە، ئینجا هاتە دەرەوەو دیتی وا سەگێك زوبانی دەرهێناوەو لە بەر تێنووەتی خۆڵو خاك ئەخوا، جا پیاوەکە گوتی: ئەو سەگە وەکو من تێنووەتی کاری تێکردوە. جا پیاوەکە چووە ناو بیرەکەو پڕ بە خوفەکەی ئاوی هێناو دایە سەگەکە، جا لە بەر ئەوە خوا سوپاسی کردو لێی خۆش بوو. ئینجا هاوڕێکانی پێغەمبەر ﷺ فەرموویان: ئایا ئێمەش لە ئاژەڵەکانی خۆمان خێرمان ئەگاتێ کە ئاویان ئەدەین؟ فەرمووی: بەڵێ: هەرچی خاوەن جەرگی تەڕ بێ، بەزەییتان پێیدا بێ، خوا پاداشتتان ئەنووسێ.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالأُجُورِ): **بزانە:** ئەم گفتوگۆیەی (صَحابَة)کان لە حەسوودیەوە نەبو، بەڵکو حەسوودیی پێشبڕکێ بوو بۆ کاری چاکە، ئەم پێشبڕکێیەش خێرەو پێی ئەگوترێ: (غِبْطَة). پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ حَسَدَ إلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالاً فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ﴾ رواهُ الشَّيْخَان، واتە: حەسوودیی پێشبڕکێ تەنها لە دوو شێوەدا ڕەوایە: **یەکەمیان:** دەربارەی پیاوێك: کە خوایگەورە فێرە قورئانی کردبێو لە کاتەکانی شەو و ڕۆژدا بیخوێنێ، **دووەمیان:** دەربارەی پیاوێك: کە خوای گەورە ماڵی دابێتێو لە کاتەکانی شەو و ڕۆژدا لە ڕێگای خوا ببیبەخشێ.

٢- (وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ): **بزانە:** لە پێش دەستپێکردنی جیماع، سوننەتە: ژنو مێرد ئەم دوعایە بخوێنن: ﴿بِسْمِ اللهِ اَللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا﴾ رواهُ الشَّيْخَان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەم دوعایەیان خوێندو منداڵێك لەم جیماعە دروست کرا، شەیتان زیانی پێناگەیەنێ.

٣- (أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ...): **بزانە:** جیماع کردن حەرامە: لە ماوەی حەیز و لە ماوەی خوێنی پاش منداڵبوون، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ﴾ خۆتان بپارێزن لە جیماعی ژنەکەتان لەو ماوەیەی لە حەیزدانە.

# ( اَلْحَديثُ السّادس والْعشْرون: كُلُّ أَحَد عَلَيْه صَدَقَةٌ )

﴿ عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُلُّ سُلاَمَى مِنَ النَّاس عَلَيْه صَدَقَةٌ كُلَّ يَوْم تَطْلُعُ فِيه الشَّمْسُ: تَعْدلُ بَيْنَ الإِثْنَيْنِ صَدَقَةٌ، وَتُعِينُ الرَّجُلَ فِي دَابَّته فَتَحْمِلُهُ عَلَيْهَا أَوْ تَرْفَعُ لَهُ عَلَيْهَا مَتاعَهُ صَدَقَةٌ،

---

هەروەها جیماع کردنیش لە کونی پاشەوەدا حەڕامە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ يَنْظُرُ اللهُ إِلَى رَجُلٍ أَتَى رَجُلاً أَوِ امْرَأَةً فِيالدُّبُرِ﴾ رواهُ التّرمذي، خوای گەورە بە چاوی ڕەحمەت تەماشای ئەو پیاوە ناکا کە نێربازی بکا، یان لە کونی پشتەوە جیماع لەگەڵ ژنەکەی بکا. واتە: خوای گەورە بە چاوی لەعنەتو غەزەب تەماشای دەکا.

٤- (إِذَا وَضَعَهَا فِيالْحَلاَلِ كَانَ لَهُ أَجْرٌ): پێغەمبەری خۆشەویست ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَشَرَّ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَة: الرَّجُلُ يُفْضِي إِلَى امْرَأَته وَتُفْضِي إِلَيْه ثُمَّ يَنْشُرُ سرَّهَا﴾ رواهُ مُسْلم، ولأصحاب السنن: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ ذَلكَ مَثَلُ شَيْطَانَة لَقِيَتْ شَيْطَانًا فِيالسِّكَّة فَقَضَى مِنْهَا حَاجَتَهُ وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ إِلَيْه﴾، واتە: خراپترین کەس لە لای خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی: پیاوێکە لەگەڵ ئافرەتەکەی جیماع بکا، ئینجا نهێنییەکانی جیماع بگێڕێتەوە، مەسەلەی ئەو ژنو مێردەی نهێنی جیماع کردن باس ئەکەن: وەکو مەسەلەی شەیتانێکە لە کۆڵان سواری شەیتانێك بێو جیماعی لەگەڵ بکاو خەڵکیش تەماشای بکەن.

## ﴿ حەدیسی بیستو شەشەم: هەموو کەس خێرێکی لە سەرە ﴾

(عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ) ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، ئەفەرموێ: (قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (كُلُّ سُلاَمَى مِنَ النَّاسِ) هەموو ئێسكو جومگەیەكی ئادەمیزاد (عَلَيْهِ صَدَقَةٌ) خێرێکی لە سەرە (كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيهِ الشَّمْسُ) هەموو ڕۆژێك کە خۆر دەرئەکەوێ، واتە: سوپاسی خوا بکەی بەرامبەر ئەو چاکەی لەگەڵتی کردوە: کە (٣٦٠) جومگەت هەیەو هەمووی نەرم کردوە بۆ جموجۆڵ، ئینجا ئەگەر چاکە نەکەی، خراپەش بەو جومگانە مەکە.

(تَعْدِلُ بَيْنَ الإِثْنَيْنِ صَدَقَةٌ) ئاشتکردنەوەی دوو کەس کە ناکۆکییان هەیە خێرێکە، بە مەرجێ ئاشتکردنەوەکە لە چوارچێوەی ئیسلام دەرنەچێو حەڕامی پێ حەڵاڵ نەکرێو حەڵاڵی پێ حەڕام نەکرێ. **بزانە:** درۆکردن دروستە بۆ ئاشتکردنەوە.

(وَتُعِينُ الرَّجُلَ) یارمەتی مرۆڤ بدەی (فِي دابَّته) دەربارەی وڵاغەکەی (فَتَحْمِلُهُ عَلَيْهَا) تا سواری وڵاغەکەی ئەکەی (أَوْ تَرْفَعُ لَهُ عَلَيْهَا مَتَاعَهُ) یان دەستباری لەگەڵ بکرێو بارەکەی لەگەڵ بار بکەی (صَدَقَةٌ) ئەمەش خێرێکە. **جا بزانە:** هەتا بەردەوام بی لە یارمەتیدانی موسوڵمانان، خوداش یارمەتی تۆ ئەدا.

وَالْكَلِمَةُالطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَبِكُلِّ خَطْوَةٍ تَمْشِيهَا إِلَى الصَّلاَةِ صَدَقَةٌ، وَتُمِيطُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ﴾ رواهُ الْبُخارِيُ وَمُسْلِم.

---

(وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ) قسەیەکی شیرینو باش خێرێکە. واتە: بە ڕووخۆشی لەگەڵ موسوڵمانان گفتوگۆ بکە، سڵاویان لێبکە، دوعایان بۆ بکە، ناوی خوا بێنەو قسەی سوكو چروك مەكە.

(وَبِكُلِّ خَطْوَةٍ تَمْشِيهَا إِلَى الصَّلاَةِ صَدَقَةٌ) هەموو هەنگاوێکیش کە بۆ نوێژ ئەڕۆی خێرێکە. کەوابوو: نوێژکردنی بە جەماعەت لە مزگەوت لە دەست خۆت مەدە، چونکە خێری نوێژی جەماعە یەك بە (٢٧)، هەر هەنگاوێکیش خێرێکە، ئەمەش قازانجێکی زۆرە بۆ موسوڵمان.

(وَتُمِيطُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ) لابردنی ئەو شتانەی زیان لە ڕێبوار ئەدەن لە سەر ڕێگە، ئەوەش خێرێکە. جا ئەمەیان نزمترین بەشەکانی ئیمانە، بەرزترینیشی ووتنی (لاَ إِلَهَ إِلاَّاللهُ)یە (رواهُ الْبُخارِي وَمُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

**بزانە:** لە فەرموودەیەکی‌تری پێغەمبەرداﷺ هاتوە، کە دوو ڕکاعەت نوێژی چێشتەنگاو جێگەی ئەو خێرانە دەگرێتەوە، کەوابوو: ئەی موسوڵمان، بە لای کەمی هەموو ڕۆژێ دوو ڕکاعەت بە ناوی (صَلاَةُ الضُّحَى)=چێشتەنوێژ بکە، خۆ ئەگەر بیکەی بە چوار ڕکاعەت ئەمە زۆر باشترە، ئەگەر بیکەی بە هەشت ڕکاعەت: ئەمە زۆر خێری هەیەو تەواوترە.

جا ئەوەش **بزانە:** هەر چاکەیەکت کرد بڵێ: (اَلْحَمْدُ لله). بۆ ئەوەی خوای گەورە زیاتر یارمەتیت بدا بۆ چاکە

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (تَعْدِلُ بَيْنَ الإِثْنَيْنِ صَدَقَةٌ): براندنەوەی کێشەی نێوان دوو کەس، یان زیاتر، ئاشتکردنەوەی دوو کەس، یان زیاتر: یەکێکە لە ڕەوشتە هەرە بەرزەکانی‌ئیسلام، بەو مەرجەی لەم پێکهاتنەدا بێشەرعی ڕوو نەدا، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيَامِ وَالصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ؟ قَالُوا: بَلَى. قَالَ: إِصْلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ، فَإِنَّ فَسَادَ ذَاتِ الْبَيْنِ هِيَ الْحَالِقَةُ﴾ رواهُ التِّرمذي، ئایا پێتان بڵێم کام ڕەوشت خێری گەورەترە لە ڕۆژوو و نوێژ و خێرکردن؟ گوتیان: بەڵێ. فەرمووی: چاککردنی نێوان موسوڵمانانو براندنەوەی کێشەی نێوانیان خێری گەورەترە، چونکە تێکدانی نێوانی موسوڵمانان ئایین ئەتاشی‌و لای‌ئەبا.

٢- (وَتُعِينُ الرَّجُلَ): هەر دەربارەی یارمەتی‌دانی مرۆڤی بێدەسەلات، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَبْلِغُوا حاجَةَ مَنْ لاَ يَسْتَطِيعُ إِبْلاَغَ حاجَتِه، فَإِنَّهُ مَنْ أَبْلَغَ سُلْطاناً حاجَةَ مَنْ لاَ يَسْتَطِيعُ إِبْلاَغَها إِيَّاهُ ثَبَّتَ اللهُ قَدَمَيْه عَلَى الصِّراطِ﴾ رواه البيهقي والطبراني، واتە: ئیش‌و کاری مرۆڤی بێدەسەلات بگەیەننە لای ئەو کەسەی ئەتوانێ بۆی پێك بێنێ، چونکە

## (اَلْحَديثُ السّابع والْعشْرون: اَلْبرُّ وَالإِثْمُ)

﴿ عَنِ النَّوَّاسِ بنِ سَمْعَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: اَلْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ ﴾ رواهُ مُسْلِم.
﴿ وَعَنْ وَابِصَةَ ابنِ مَعْبَدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَ ﷺ: جِئْتَ تَسْأَلُ عَنِ الْبِرِّ وَالإِثْمِ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ ﷺ: اسْتَفْتِ قَلْبَكَ: اَلْبِرُّ مَا اطْمَأَنَّتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ وَاطْمَأَنَّ إِلَيْهِ الْقَلْبُ،

---

هەرکەسێك کاری مرۆڤی بێدەسەلات بگەیەنێتە لای خاوەن دەسەلاتێك، خوای گەورە لەسەر پردی دۆزەخ قاچەکانی ئەپارێزێ لە خلیسك بردن.
٣- (وَكُلُّ خَطْوَةٍ تَمْشيهَا إِلَى الصَّلَاةِ صَدَقَةٌ): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿ الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ كَفَّارَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ مَا لَمْ تُغْشَ الْكَبَائِرُ ﴾ رَوَاهُ مُسْلِم، ئەم پێنج نوێژانەو نوێژی جومعە تا نوێژی جومعەکەیتر، ڕەشکەرەوەو داپۆشەری گوناهە بچووکەکانن بە مەرجێ: گوناهە گەورەکان نەکرێن.

### ﴿ حەدیسی بیستو حەفتەم: چاکەو خراپە ﴾

(عَنِ النَّوَّاسِ بنِ سمْعَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) گێردراوەتەوە لە (نەوواس)ی کوڕی (سەمعان)، ئەفەرموێ: (عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اَلْبِرُّ) زۆربەی چاکە (حُسْنُ الْخُلُقِ) بریتییە لە خووو ڕەوشتی جوان: وەك ڕووخۆشیو یارمەتیدانی خەڵكو سەردانی خزمو کەسی خۆتو بەزەییهاتن بە هەژاران...هتد، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ لاَ تَسعُونَ النَّاسَ بِأَمْوالِكُمْ وَلَكِنْ يَسعُهُمْ مِنْكُم بَسْطُ الْوَجْهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ﴾ أَخْرَجَهُ أَبُويَعْلَى، واتە: ئێوە بە بەخشینی ماڵتان بەروەستی خەڵك ناکەن، بەڵام ڕوو خۆشیو ڕەوشتیجوانی ئێوە بەروەستیان ئەکا.
(وَالإِثْمُ) گوناهو خراپە (مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ) ئەوەیە: کار لە دڵت بکاو لە ناو دڵتدا جێی نەبێتەوەو ئازاری پێبگەیەنێ (وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ) هەروەها پێت ناخۆش بێ پیاوماقوڵان ئەو کردەوەی تۆ ببینن، واتە: خراپە هەر لە ناو دڵا دێو دەچێو مرۆڤ پێی ناخۆشە خەڵکی بەو خراپەیەی وی ئاگادار بن (رواهُ مُسْلِم) ئیمام(موسلیم) گێڕاویەتیەوە.
(وَعَنْ وَابِصَةَ ابنِ معبَدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: قَالَ) هەر لەو بابەتە (وابیسە)ی کوڕی (مەعبەد) ئەفەرموێ: (أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ) هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ (فَقَالَ: جِئْتَ تَسْأَلُ عَنِ الْبِرِّ وَالإِثْمِ؟) ئەویش فەرمووی: هاتوی پرسیار بکەی چاکە چییەو خراپە چییە؟ (قُلْتُ: نَعَمْ) منیش گوتم بەڵێ، بۆ ئەوە هاتوم (قَالَ اسْتَفْتِ قَلْبَكَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پرسیار لە دڵی خۆت بکە، چونکە هەستکردن بە چاکەو خراپە لە ناو دڵتدایە.
ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئەو هەستکردنەی ڕوون کردەوەو فەرمووی: (اَلْبِرُّ مَا اطْمَأَنَّتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ وَاطْمَأَنَّ إِلَيْهِ الْقَلْبُ) چاکە ئەوەیە: دڵت پێی خۆش بێو دەروونت پشوو بداو دڵت لێنەدا، لە بەر ئەوەی دوا ڕۆژی باشەو مەترسیی نیە.

وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ، وَإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتَوْكَ﴾ حديثٌ صحيح رَوَيْناهُ فِي مَسْنَدَي الإمامَيْنِ: أَحْمَدَ بنِ حَنْبَلِ، وَالدَّارَمِيِّ، بإسْنادٍ جَيِّد.

(وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ) گوناهیش ئەوەیە کار لە دڵت بکاو (وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ) لە ناو دڵتدا هاتوچۆ بکاو گیر نەبێ، لە بەر ئەوەی مەترسی دوا ڕۆژی هەیە، کەوابوو: دڵی خۆت لە هەموو کەس باشتر ئەزانێ چاکەو خراپە چییە؟ (وَإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتَوْكَ) هەر بەگوێرەی دڵت، واز لە خراپە بێنە، هەرچەند زانایانیئایینی فتوات بۆ بدەنو دیسان فتوات بۆ بدەنو بڵێن: بیکە. چونکە موسوڵمانی تەواو ئەو کەسەیە واز لە گومانلێکراو بێنێ، نەوەك تووشی حەرام ببێ ﴿عَنْ عَطِيَّةَ السَّعْدِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ يَبْلُغُ الْعَبْدُ أَنْ يَكُونَ مِنَ الْمُتَّقِينَ حَتَّى يَدَعَ مَا لاَ بَأْسَ بِهِ حَذَرًا مِمَّا بِهِ الْبَأْسُ﴾ رواهُ التِّرمذی، واتە: بەندە ناگاتە پلەی لە خواترسان تا واز لە شتی وا ئەهێنێ: کە بە کردنی زیانی پێناگا، نەوەك تووشی شتێکی وا ببێ: کە زیانی پێبگەیەنێ.

بەڵێ: زۆر جار بە لێدانی دڵ، مرۆڤ بە خۆی لە زانایئایینی باشتر ئەزانێ: ئایا ئەم شتە باشە، یان خراپە؟ چونکە زانای ئایینی ناو دڵ نابینێو لە سەر ئاشکرایی فتوا ئەدا، بگەڕێوە بۆ حەدیسی (٦و ١١).

(حديثٌ صحيح) حەدیسێکی ڕاستە (رَوَيْنَاهُ فِي مُسْنَدي الإمامَيْنِ) گێڕاونەتەوە لە کتێبی ئەم دوو ئیمامە:

**یەکەم:** (أَحْمَدَ بنِ حَنْبَلِ) ئیمام (ئەحمەد)ی کوڕی (حەنبەل) خوا لێی ڕازی بێ، یەکێکە لەو چوار زانایانەی سەر مەزهەب، لە ساڵی(١٦٤) لە دایك بووە، لە ساڵی (٢٤١)ی کۆچی لە تەمەنی(٧٧) ساڵیدا لە (بەغدا) وەفاتی کردوە، لە ژیانیخۆیدا زۆر ئازارو بەندیخانەی بینیوە لە بەر خواپەرستی، بە زۆری لە لای ئیمامی(شافعی)ی خوێندوە، ئەویش دەرسی بە ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم)و (ئەبوداود) گوتوە.

**دووەم:** (وَالدَّارِمي) ئیمام (عبدالله)ی (دارەمی) سەمەرقەندییە، یەکێکە لە زانا بەرزەکانی حەدیس، لە ساڵی (١٨١) لە دایك بووە، لە ساڵی (٢٥٥) وەفاتی کردوەو، مامۆستای ئیمام (موسلیم)و (تیرمزی)و (ئەبوداود) بووە. خوایە لە هەمووان ڕازی بە، آمین. (بِإسْنادٍ جَيِّد) ڕێگای حەدیسەکە زۆر باشە.

**ئینجا بزانە:** لە دوای جێبەجێکردنی ماف خودا چاکە لەگەڵ دایكو باوكو خزمان لە گشت چاکەیەك گەورەترە ﴿عَنْ بَهْزِ بن حَكِيمٍ عَنْ أَبِيه عَنْ جَدِّهِ ﷺ قُلْتُ: يَا رسول الله ﷺ مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: أُمَّكَ...ثُمَّ أُمَّكَ...ثُمَّ أُمَّكَ...ثُمَّ أَبَاكَ، ثُمَّ الأَقْرَبَ فَالأَقْرَبَ﴾ رواه أبوداود، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کێ چاکە بکەم؟ لە وەڵاما سێ جار فەرمووی: لەگەڵ دایکت، ئینجا لەگەڵ باوکت، ئینجا لەگەڵ خزمی نزیکتر، ئینجا، ئینجا.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (اسْتَفْتِ قَلْبَكَ): **بزانە:** هەر کاتێك زانایەکی ئایینی باوەڕپێکراو (فَتْوا)ی بۆ دای، لە ڕاستی ئەم (فَتْوا)یەش دڵنیا بوی، هیچ زانایتریش بە پێچەوانە (فَتْوا)ی تری نەدا، تۆش ڕەفتار بەم (فَتْوا)یە بکە، ئەگەر (فَتْوا)یەکە بە هەڵەش بوو، تۆ تاوانبار نابی، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ أُفْتِيَ بِغَيْرِ عِلْمٍ كَانَ إِثْمُهُ عَلَى مَنْ أَفْتَاهُ﴾ رواهُ أبوداود، هەر کەسێك (فَتْوا)ی ناڕاستی بۆ درا، ئەوە تاوانەکەی لە سەر (فَتْوا)دەرەکەیە.

جا ئەگەر هاتوو زانایەکی‌تر (فَتْوا)یەکی بە پێچەوانەی ئەم (فَتْوا)یەی دایێ، واجبە هەوڵ بدەی تاکو ڕاستیت بۆ دەربکەوێ، جا ئەگەر ڕاستیت بۆ دەرنەکەوت و سەرت لێ شێوا، بۆ بەرژەوەندی ئایینەکەت (فَتْوا)ی حەرام وەربگرەو کارەکە مەکە؟ چونکە بووەتە (شُبُهات)، بگەڕێوە حەدیسی (٦و ١١).

٢- (وَإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتَوْكَ): ئەی موسوڵمانی بەڕێز: زۆر ئاگاداربە زۆر ئاگاداربە: هەموو جۆرە زانایەك مافی (فَتْوا)دانی نیە، بەڵکو ئەو کەسەی (فَتْوا) ئەدا، ئەبی لە شەرعی‌ئیسلام شارەزا بێ، کەوابوو: ئەگەر کەسێك قورئان و حەدیسی زۆری لەبەر بوو، بەڵام لە شەرعی‌ئیسلام شارەزا نەبو، ئەوە تەنها بۆی هەیە بانگەوازی ئیسلامی بکا، بۆی دروست نیە (فَتْوا) بدا، هەروەکو پزیشکی ددان بۆی نیە دەستکاری چاو بکا.

کەوابوو: هەر کەسێك لە سنوری زانستی تایبەت بە خۆی نەوەستێ و بە نەزانی بچێتە ناو زانستێکی‌تر، ئەوە خۆیشی گومڕا ئەبێ و خەڵکیش گومڕا ئەکا، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ النَّاسِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ عَالِمٌ اتَّخَذَ النَّاسُ رُؤُوسًا جُهَّالاً فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا﴾ رواهُ الشَّيْخان، واتە: خوای گەورە زانستی ئایینی بەو جۆرە لانابا: کە لە سینەی خەڵکی دەربێنێ، بەڵام بە هۆی مردنی زانایانی‌ئایینی زانست لائەبا، تا وای لێ دێ: زانای ئایینی نامێنن، جا ئەم خەڵکە هەر کەسە گەورەو سەرکردەیەکی نەزان بۆ خۆی دائەنێ و پرسیاری ئایینییان لێ ئەکرێ، ئەوانیش بە نەزانی (فَتْوا) ئەدەن، بەم (فَتْوا)یە بە خۆیان گومڕا ئەبن و خەڵکیش گومڕا ئەکەن.

کەوابوو: ئامۆژگاریت ئەکەم: زۆر زۆر لە مامۆستاو ئەمیرەکانی ئەم سەردەمە بترسەو ئەم حەدیسە هەر لە بەرچاوت بێ! چونکە (گورگی فێڵباز لە ناو پێستەی مەڕدایە).

## ﴿ حەدیسی بیست و هەشتەم: ئامۆژگاری پێغەمبەرﷺ بۆ سەحابەکان ﴾

(عَـنْ أَبِـى نَجِيحِ الْعِرْبَـاضِ بـنِ سَـارِيَةَ السَّـلَمِي) رضي الله عنه (عیرباض)ی کوڕی (ساریە)، یەکێکە

قالَ: وَعَظَنا رَسُولُ اللهِﷺ. مَوْعظَةً وَجلَتْ منْهَا الْقُلُـوبُ، وَذَرَفَـتْ منْهَــا الْعُيُــونُ، فَقُلْنا: يَا رَسُولَ اللهِﷺ كَأَنَّها مَوْعظَةُ مُوَدِّعٍ فَأوْصنا. قَـالَﷺ: أُوصِـيكُمْ بتَقْـوَىالله وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَة، وَإنْ تَأَمَّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ، وَإنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرَى اخْتلافًــا كَــثيراً، فَعَلَيْكُمْ بسُنَّتِي وَسُنَّة الْخُلَفاء

---

له سهحابهی پێغهمبهرﷺ چوارهمین کهس بوو: که له (مهککه)ی پیرۆز موسوڵمان بووه، (٣١) حهدیسی گێڕاونهوه، له ساڵی (٧٥)ی کۆچی وهفاتی کردوه، خوا لێی ڕازی بێ.

(قالَ) فهرمووی: (وَعَظَنا رَسُولُ اللهِﷺ) پێغهمبهرﷺ ئامۆژگاریهکی کردین له دوای نوێژی بهیانی (مَوْعظَةً: وَجلَتْ منْهَا الْقُلُوبُ) ئامۆژگاریهکه ئهوهنده به نرخ بوو: دڵی پێ ئههاته ترسان (وَذَرَفَتْ منْهَا الْعُيُونُ) چاوی پێ ئههاته گریانو فرمێسکی ئهباراند (فَقُلْنا: يَا رَسُولَ اللهِﷺ) جا ئێمهش گوتمان: ئهی پێغهمبهری خواﷺ (كَأَنَّها مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ) لهو ئامۆژگاریهت وا دهردهکهوێ: ئامۆژگاری ماڵئاوایی بێ، چونکه زۆر بایهخی پێئهدهی (فَأَوْصنا) کهوابوو: چ فهرمانێکت ههیه پێمان ڕابگهیهنه.

(قَالَ: أُوصِيكُمْ بِتَقْوَىالله) پێغهمبهرﷺ فهرمووی: ئامۆژگاریتان ئهکهم له خوا بترسنو له فهرمانی دهرنهچن (وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَة) ههروهها فهرمانتان ئهدهمێ: که گوێڕایهڵ بن بۆ گهورهکانتانو له فهرمانیان دهرنهچن (وَإنْ تَأَمَّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ) ههرچهنده گهورهتان قوڵهڕهشێکی حهبهشی بێ ههر له فهرمانی دهرمهچون.

چونکه پێویسته ههموو کهس لهو دونیایه گهورهو سهردارێکی ههبێ بۆ ئهوهی کاروبار ڕێك بکهوێ، جا ئهگهر بۆ ئهو گهورهیه گوێڕایهڵ نهبینو له فهرمانی دهرچین، کاروبار ڕێك ناکهوێو کۆمهڵ تێك ئهچێ، بۆیێ پێغهمبهرﷺ ئهفهرموێ: ﴿مَنْ خَرَجَ مِنَ الطَّاعَة وَفَارَقَ الْجَماعَةَ ثُمَّ مَاتَ، مَاتَ مِيتَةً جَاهلِيَّةً﴾ رَواهُ مُسْلِم، ههر کهس له فهرمانی گهورهی خۆی دهرچێو له کۆمهڵی موسوڵمانان جیا بێتهوه، ئینجا بمرێ، وهك مردنی (جاهلیة) ئهمرێ، واته: جیاوازی نیه: لهگهڵ لایهنه نائیسلامهکان له شێوهی مردنیا.

**ئاگاداری:** مهرجی گوێڕایهڵیو له فهرمان دهرنهچوون ئهوهیه: که دژ به شهریعهتی ئیسلام فهرمان نهدا، ئهگهر به پێچهوانهی شهرع فهرمانی دهرکرد، تۆش له دژی ڕاپهڕهو دروست نیه به قسهی بکهی.

(وَإنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ) بهڕاستی ههر یهکێکتان له دوای من بمێنێ (فَسَيَرَى اخْتِلاَفًا كَثِيراً) پهرتهوازهو ناکۆکیهکی زۆر ئهبینێ، له نێوان موسوڵمانانندا (فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي) جا ئهگهر ئێوه گهیشتنه ئهو ناکۆکیه، دهست به یاساو ڕێگای من بگرن (وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ) ههروهها دهست به ڕێگاو ڕهوشتی ههر چوار خهلیفهکانیمن بگرن. واته: ههر چوار جێنیشهکانی پێغهمبهرﷺ: که ئیمامی(أبوبکر)و ئیمامی(عمر)و ئیمامی(عثمان)و ئیمامی (علی)ن

الرَّاشدينَ الْمَهْدِيِّين، عَضُّوا عَلَيْهَا بالنَّوَاجذ، وَإيَّاكُمْ وَمُحْدَثَات الأُمُور فَإنَّ كُلَّ بدْعَةٍ ضَلالَةٌ﴾ رَوَاهُ أَبُوداودَ وَالتّرمذي وَقَالَ: حَديثٌ حَسَنٌ صَحيح.

(الرَّاشِدِينَ) ئەو چوارانە لە سەر ڕێگای منن (الْمَهْدِيِّينَ) ئەوان شارەزای ڕێگای ڕاستن. واتە: ئەگەر ئەو چوارانە، یان یەکێك لەوان فەرمانێکیان دەرکرد، پێویستە بە قسەی ئەوان بکرێ زیاتر لە فەرمانی سەحابەکانیتر، خوا لێیان ڕازی بێ.

جا لەو چوارانەش فەرمانی ئیمامی (أبوبكر)و ئیمامی(عمر) لە هەموویان لە پێشترە، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إقْتَدُوا باللَّذيْنِ منْ بَعْدي: أَبِيبَكْرٍ وَعُمَرَ﴾ رواهُ التّرمذي، شوێن ئەو دوو (خليفة)یە بکەون کە لە دوای من دێن: کە (أبوبكر)و (عمر)ن.

**ئینجا بزانە:** مەبەست بە سوننەتی پێغەمبەرﷺ لێرەدا قورئانو حەدیسە، مەبەست بە سوننەتی هەر چوار خەلیفەکان ڕوونکردنەوەی ئەوانەو تێگەیشتنی ئەوانە لە قورئانو حەدیس، چونکە ئەوان لە هەموو کەس لە ئایینیئیسلام شارەزاترن، لە بەر ئەوە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ) یاسای ئەو چوار خەلیفانە بە ددان بگرنو بەری مەدەن (وَإِيَّاكُمْ) زۆر ئاگاداری خۆتان بن (وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ) خۆتان دوور بخەنەوە لەو شتانەی لە ئایینیئیسلام پەیدا ئەکرێنو ناوی ئایینییان لێئەنرێ، چونکە ئەوانە بیدعەنە (فَإنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ) هەرچی بیدعە هەیە: هەمووی ئەبێتە سەر لێشێوانو گومڕایی (رَوَاهُ أبُوداودَ وَالتّرْمذي، وَقَالَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيح) ئیمام (أبوداود)و (تیرمزی) گێڕاویەتیانەوە.

**پێناسە:** بیدعە: پەیداکردنی شتێکی تازەیە لە ئایینیئیسلام، بە بێ فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ.

**ڕوون کردنەوە:** بیدعە دوو بەشە: ١- قەبیحە، واتە: ناشیرین. ٢- حەسەنە، واتە: جوان. هەر شتێك لە قورئانو حەدیس ڕێگای بۆ نەدۆزرێتەوە بیدعەی قەبیحەیەو حەرامە ئیشی پێ بکرێ. ئەگەر ڕێگای بۆ دۆزرایەوە ئەمە بیدعەی حەسەنەیەو دروستەو خێرە ئیشی پێ بکرێ. بەڵگە:

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ سَنَّ فِي الإسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ أَجْرُهَا وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا، وَمَنْ سَنَّ فِي الإسْلاَمِ سُنَّةً سَيِّئَةً كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا﴾ رواهُ مُسْلِم، واتە: هەرکەس لە ئیسلامدا ڕەوشتو یاسایەکی باش دابنێ ئەوە پاداشی خۆی هەیە، بە قەد ئەوانەی ڕەفتاریشی پێئەکەن پاداشی هەیە، وە هەرکەسێك لە ئیسلامدا یاسایەکی ناشیرین دابنێ، ئەمە تاوانی خۆی هەیەو بە قەد ئەوانەی ڕەفتاریشی پێئەکەن تاوانی بۆ ئەنوسرێ.

ئەمە پارچەیەکە لە حەدیسێکیدرێژ، ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

واتـەی (سَنَّ) ئەوهایـە: شـتێك نـەبوبێو تـازە پەیدا بکرێ، لەگـەڵ واتـەی (بِدْعَـة) یـەك ئەگرێتەوە، کەوابوو: بیدعە دوو بەشە، وەکو گوتمان.

**بۆ وێنە:** چاپکردنی قورئانو حەدیس، هەروەها کۆکردنەوەی قورئانو حەدیس، سـەرو بـۆرو ژێر کردنی قورئان، هەموویان بیدعەی حەسـەنەیە، ئـەو کەسـەی یەکـەم جـار ئـەو یاسـایەی داناوە خێـری هەیـە، چـونکە لـە کـاتی خـۆی پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی داوە بـە نووسـینەوەی قورئانو حەدیس، ئەو بیدعەیە ئەچێتە ژێر ئەو فەرمانەو ئەبێتە (حَسَنَة)، واتە: جوانو باش.

وەرگێڕانی تەفسیری قورئانو حەدیس بۆ هەر زمانێك، بیدعەی (حَسنة)یە چونکە ئەچێتە ژێر ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ﴾ واتە: هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێ بە زمانی نەتەوەی خۆی ناردومانە، تا فەرمانی خوایان بۆ ڕوون بکاتەوە.

هەر پارتایەتیو کۆمـەڵێكو هـەر ڕێکخراوێك هـەبێ، بـە هـەر ناوێك بـێ، کـە بـۆ ئیسـلامی ڕاستەقینە نەبێ، بە (بِدْعَة قَبِيحَة) دائەندرێ، لە بەر ئایەتی ﴿وَلاَ تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُـمْ عَـنْ سَـبِيلِهِ﴾، واتـە: بـە دوای ڕێچـکەکان مەکـەون، چـونکە پەرتـەوازەتان پێ ئەکـەنو لە ڕێگای خوا لاتان ئەدەن.

جا ئەی موسوڵمانی خۆشەویست: بۆیێ لێرە درێژەم پێدا چونکە زۆر لە لاوانی موسـوڵمان پلەی خوێندەواریو شارەزایی ئایینیان نزمە، زۆریش دڵسۆزی ئـایینن، لـە بـەر ئـەوە هـەر شتێ ببینن ئەڵێن: بیدعەیە. چونکە مانای بیدعە نازاننو لـە زانسـتی ئـایین چـەند ئایـەتو حەدیسێك ئەزاننو بەمە لێی پاڵ ئەدەنەوە، لەمە زیاتر هێزێکی وایان نیە بەڵگەی بیدعە لە قورئان، یان حەدیس، بدۆزنەوە: ئایا باشە، یان خراپە؟.

بەڵام بە هەر جۆر، ئێستا بیدعەی قەبیحە گەلێك زۆرنو لە سەر ئیسلام ئەژمێردرێن، خـواو پێغەمبەرﷺ لێیان نارازین. بگەڕێوە بۆ حەدیسی (٥)م.

**﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾**

١- (السَّمْعِ وَالطَّاعَـةِ): **بزانـە:** بـۆ گوێڕایـەڵیو ڕانەپـەڕین لـە دژی کاربەدەسـتەکانمان، پێغەمبەرﷺ چوار مەرجی داناون:

**یەکەم:** ﴿إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْراً بَواحاً﴾ رواهُ الشَّيْخان، لە دژیان ڕامەپەڕن مەگـەر کـافربوونێکی ئاشکرا ببیـنن. **دووەم:** ﴿فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ﴾ رواهُ الشَّيْخان، هـەر کاتێـك فەرمانی بە خراپە پێکرا، گوێڕایەڵی دروست نیە. **سێیەم:** ﴿يَقُودُكُمْ بِكِتَـابِ اللهِ﴾ رواهُ مُسْـلِم، گوێڕایــەڵی کاربەدەسـت بـن، ئەگــەر ئــەم خەڵکــەی بــە قورئــان، واتــە: بە شەریعەتیئیسلام بەڕێوە ئـەبرد. **چـوارەم:** ﴿مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّـلاَةَ﴾ رواهُ مُسْلِم، لـە دژیان ڕامەپەڕن، هەتا نوێژ لەگەڵ ئێوەدا ئەکەنو فەرمان بە نوێژ ئەکەن.

## ( اَلْحَديثُ التّاسع والْعشْرونَ: طُرُقُ الْجَنَّة كَثيرَةٌ )

﴿ عَنْ مُعَاذ بْن جَبَلٍ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ وَيُبَاعِدُنِي عَنِ النَّارِ؟ قَالَ ﷺ: لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْ عَظِيمٍ وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ سَهَّلَهُ اللهُ عَلَيْهِ: تَعْبُدُ اللهَ وَلاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا،

---

٢- (فَسَيَرَى اخْتِلافًا كَثيراً): دەربارەی ئەم پەرتەوازەیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿تفتَرِقُ هَذه الأُمَّةُ عَلَى ثَلاَث وَسَبْعِينَ مِلَّةً كُلُّهَا فِي النَّارِ إِلاَّ وَاحِدَةً: وَهِيَ الْجَمَاعَةُ، وَفِي رِوَايَة: مَا أَنَا عَلَيْهِ الْيَوْمَ وَأَصْحَابِي﴾ رواهُ التّرمذی والحاكم، ئەم ئوممەتەی من پەرتەوازە ئەبێ و ئەبێتە حەفتاو سێ گرۆھ، گشتیان ھەڵەنەو ئەچنە دۆزەخ، تەنھا یەكێكیان نەبێ: كە كۆمەڵی گەورەیە، واتە: (أَهْلُ السّنَّة والْجَماعة)یە، كە لە سەر ڕێبازی ئێستای منو سەحابەكانی منە.

كەوابوو: ئەی موسوڵمانی بەڕێز: زۆر ئاگاداری خۆت بە، ئەم حەفتاو دوو گرۆھە گومڕابووە فێڵت لێنەكەنو بە ناوی ئایین تەفرەت نەدەن، چونكە زۆر لە سەركردەو ئەندامانی ئەم گرۆھانە بۆ بەرژەوەندی گرۆھەكەیان قسەی سەر قۆزو بن ئاڵۆز ئەكەن، دەمارگیری (حزبي)و (مَذهبي) وای لێكردون (فَتوا)ی سەركردەكانی خۆیان پێ باشترە لە فەرموودەی ھەر چوار (خَليفة)كان.

ئینجا تاكو لە داوی ئەم فێڵبازانە ڕزگار ببی، بۆ ڕوونكردنەوەی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ ھەر چوار (خَليفة)كان بگەڕێوە سەر ڕوونكردنەوەی زانایانی سەدەكانی یەكەمو دووەمو سێیەم، كە پێیان ئەگوترێ (السَلَف الصَّالح)، پێغەمبەر ﷺ شاھیدی بۆ داون.

**ئاگاداری**: ووشەی (هَذه الأُمَّة) وا ئەگەیەنێ: كە ئەم حەفتاو سێیە، گرۆھی ئایینین، نەك (علمانی)؟ چونكە ئەوان بە شەرعی ئیسلام ڕەفتار ناكەن.

### ﴿ حەدیسی بیستو نۆیەم: ڕێگای بەھەشت زۆرن ﴾

(عَنْ مُعَاذ بْنِ جبَلٍ رضي الله عنه قَالَ) موعازی كوڕی جەبەل فەرمووی (قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ) گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ) كردەوەیەكم پێ بڵێ (يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ) ئەو كردەوەیە بمباتە بەھەشت (وَيُبَاعِدُنِي عَنِ النَّارِ) وە لە ئاگری دۆزەخ دوورم بخاتەوە؟

(قَالَ: لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْ عَظِيمٍ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی دەربارەی شتێكی زۆر گرنگو گەورە پرسیارت كرد (وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ سَهَّلَهُ اللهُ عَلَيْهِ) وە ئەو كردەوەیەش زۆر ئاسانە بۆ كەسێك: كە خوا بۆی ئاسان بكاو یارمەتی بدا.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ كردەوەكەی بۆ ڕوون كردەوەو فەرمووی: (تَعْبُدُ اللهَ) تەنھا ھەر خوا بپەرستە (وَلاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا) وە ھیچ شتێك مەكە بە ھاوبەش بۆ خواو كردەوەی باشت

وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ الْبَيْتَ. ثُمَّ قَالَ ﷺ: أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ؟: اَلصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ، وَصَلاَةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ تَلاَ (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ) حَتَّى بَلَغَ (يَعْمَلُونَ).

---

بە دڵسۆزیەوە هەر بۆ خوا بێ (وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ) نوێژ بکە (وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ) زەکات بدە (وَتَصُومُ رَمَضَانَ) مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو ببە (وَتَحُجُّ الْبَيْتَ) حەجی ماڵی خوا بکە.

(ثُمَّ قَالَ) ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ) ئەی موعاز، ئایا پێت خۆشە چەند ڕێگایەکی چاکەت پێ بڵێم؟ (اَلصَّوْمُ جُنَّةٌ) ڕۆژووگرتنی سوننەت پارێزەرە بۆ تۆ لە ئاگری دۆزەخ (وَالصَّدَقَةُ) خێرکردن (تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ) گوناهی بچوك لائەبا (كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ) هەروەك ئاو ئاگر ئەکوژێنێتەوە.

**بزانـــە:** گوناهی گەورە بە خێرکردن لاناچێ و ئەبی تۆبە بکا، وە ئەو گوناهانەی پەیوەندییان بە ئادەمیزادەوە هەیە: جا گەورە بێ، یان بچووك، ئەبی خاوەنەکەی ڕازی بکاو تۆبەش بکا، ئەگینا: لاناچێ. بگەڕێوە بۆ حەدیسی (١٨).

(وَصَلاَةُ الرَّجُلِ) نوێژکردنی مرۆڤ (مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ) لە ناوەندی شەوەوە دروشمی پیاوچاکانە (ثُمَّ تَلاَ) ئینجا پێغەمبەرﷺ بۆ بەڵگە هێنانەوە لە سەر پیاوچاکی ئەو کەسەی کە بە شەو نوێژ ئەکا، ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾ تەنیشتەکانیان جیا ئەبێتەوە لە یاتاخی نوستن. واتە: لە خەو هەڵئەستن بەشەو ﴿يَدْعُونَ رَبَّهُمْ﴾ خوای خۆیان ئەپەرستن و شەونوێژ ئەکەن ﴿خَوْفًا﴾ لە ترسی دۆزەخ ﴿وَطَمَعًا﴾ وە بە تەمای بەهەشتن ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ ئەو ماڵەی داومانە بەوان، هەندێکی ئەدەنە فەقیرو هەژارو لە ڕێگای چاکە سەرفی ئەکەن ﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ﴾ کەس نازانێ ﴿مَا أُخْفِيَ لَهُمْ﴾ ئەوەی لە بەهەشت بۆیان ئامادە کراوە ﴿مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ لەوەی چاو پێی خۆش ئەبێ ﴿جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەوەش پاداشی ئەو کردەوە باشانەیە: کە لە دونیادا ئەیانکرد.

ئەی موسوڵمان: خواپەرستی لە شەوێدا خێری زیاترە لە هەموو کاتێکیتر، لە هەمووش خێرتر نوێژکردنی شەوە، ئینجا ئەگەر پێش نوستن نوێژ بکەی پێی ئەگوترێ: (شەونوێژ). ئەگەر لە دوای نوستن بیکەی پێ ئەگوترێ: (تَهَجُّد). ئەمەیان لە هەموویان گەورەترە، وەلای کەمی شەونوێژو تەهەجود: دوو ڕەکاتە، بە ناوی شەونوێژ، یان تەهەجود لای زۆر: هەتا بەیان ئەدا هەر نوێژ بکە، ئینجا ئەگەر ناتوانی نوێژ بکەی، قورئان بخوێنە، ئەگەر نا: زیکری خوا بکەو دوعا بکە، وە (أَسْتَغْفِرُ اللهَ) لە کاتی پاشیودا، لە هەموو زیکرێك خێری زیاترە، هەر چییێکی لەوانەی گوتمان بیکەی خێری خواپەرستی شەوت بۆ ئەنووسرێ و وەبەر ئەو دوو ئایەتە ئەکەوی.

ثُمَّ قَالَ ﷺ: أَلاَ أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الأَمْرِ وَعَمُودِهِ وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ. قَالَ ﷺ: رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلاَمُ، وَعَمُودُهُ الصَّلاَةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ. ثُمَّ قَالَ ﷺ: أَلاَ أُخْبِرُكَ بِمَلاَكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ

---

(ثُمَّ قَالَ) ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَلاَ أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الأَمْرِ) ئایا پێت بڵێم سەری هەموو خواپەرستی‌یەك چی‌یەو (وَعَمُودِهِ) كۆڵەگەی ئایین چی‌یەو (وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ) بەرزترین لووتكەی ئایین چیە؟
(قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ) گوتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ (قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلاَمُ) سەری هەموو كارێك ئیسلامبوونەو بیروباوەڕی تەواوە: بە خواو پێغەمبەر ﷺ (وَعَمُودُهُ الصَّلاَةُ) كۆڵەگەی ئایین نوێژكردنە. (وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ) لوتكەی هەرە بەرزی ئایین (اَلْجِهَادُ) تێكۆشانە بۆ بەرزكردنەوەی ئیسلام: بە گیان‌و بە ماڵ‌و بە زمان.
بەڵام تێكۆشانی چەكدارانە—كە پێی ئەگوترێ: (غەزا)— لە هەموویان خێرترە، چونكە گیانی خۆی ئەفرۆشێتە خوای گەورەو بەهەشتی لێوەرئەگرێ، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَا تَرَكَ قَوْمٌ الْجِهَادَ إِلاَّ عَمَّهُمُ اللهُ بِعَذَابٍ﴾ رواه الطبراني، هەر نەتەوەیەك واز لە (جهاد) واتە: لە تێكۆشانی ڕێگای خوا بێنێ، خوای گەورە بە تێكڕایی تووشی ئازارو ژێردەستەیان ئەكا.
(**جهاد**) واتە: تێكۆشان لە ڕێگای خوا، پێویستە بۆ لابردنی دەستەڵاتی تاغوت‌و نۆكەرانی كوفرو بۆ چەسپاندنی حوكمی خوا لە سەر زەمینی‌خواو ڕزگاركردنی پیاو و ژن‌و مندااڵنی چەوسێندرایەوە، هەركەسێك واز لە جیهاد بێنێ خوا ژێردەستەو سەرشۆڕی ئەكا، ناموس‌و وواڵتیشی لە دەست ئەچێ، خۆ ئەگەر بە حوكمی كوفر ڕازی بێ‌و حوكمی خوای نەوێ، ئەو كەسە كافریش ئەبێ.
**بزانە:** هەموو سەربەرزی بۆ ئەو كەسەیە: كە لە ڕێگای خوا تێ‌ئەكۆشێ، ئەوانەی ئەڵێن: ئێستا جیهاد سودی نیە، كەوابوو پێویست ناكا جیهاد بكرێ. یان ئەڵێن: ئایا جیهاد لە كوێ بكەین؟ خۆ كاربەدەستەكان موسوڵمانن هەرچەند حوكمیش بە قورئان نەكەن، چونكە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەر ﷺ هەیە، وە لەشكری ئەوانیش زۆر موسوڵمانی تێدایە چونكە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەر ﷺ هەیە، چۆن بیانكوژین؟
لە وەڵامدا ئەڵێین: ئەو كاربەدەستانەی ئێستا خۆیان سەپاندوە بە سەر وواڵتانی‌ئیسلامدا، هەموویان نۆكەری كافرەكانن، بۆیێ حوكمی قورئان ناچەسپێنن‌و دژ بە هەموو پێشكەوتنێكی ئیسلامی ئەوەستن‌و بایەخ بە بەدڕەوشتی ئەدەن، ئەوەی یارمەتی ئەوانیش ئەدا، وەكو ئەوانەو نوێژكردنەكەی سودی نیە. بڕوانە حەدیسی (٣٤).
(ثُمَّ قَالَ) دیسان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَلاَ أُخْبِرُكَ بِمَلاَكِ ذَلِكَ كُلِّهِ) ئایا پێت بڵێم: شتێك هەیە: ئەوەی ووتمان گشتی لێكۆ ئەبێتەوە؟ (قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ) گوتم: بەڵێ ئەی

فَأَخَذَ ﷺ بلسَانه وَقَالَ: كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا. فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ الله وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِه؟ فَقَالَ ﷺ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ! وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ، أَوْ-قَالَ- عَلَى مَنَاخِرِهِمْ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ؟﴾ رواهُ التِّرمذي، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صحيح.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ (فَأَخَذَ بِلِسَانِه) پێغەمبەر ﷺ زوبانی خۆی بە دەست گرتو (ثُمَّ قَالَ) ئینجا فەرمووی: (كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا) خۆت لە مە بپارێزە.
(فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِه؟) منیش گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا چۆن بە هۆی گفتوگۆمان سزا ئەدرێین؟ (فَقَالَ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ!) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دایکت بزرت بکا، چۆن ئەمە نازانی! -(لێرەدا مەبەست دوعای خراپ نیەو مەبەست سەرسوڕمانە)- (وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ) ئایا هیچ هۆیەك هەیە کە زۆرترینی ئەو خەڵکە فڕێ بداتە ناو ئاگری دۆزەخ (عَلَى وُجُوهِهِمْ، أَوْ قَالَ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ) کە لە سەر ڕووی خۆیان ڕابکێشرێنە ناو ئاگر (إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ) تەنها هۆیەکە کردەوەی زوبانیانە، کە پێی ئەچنە دۆزەخ، وەك قسەی ناشیرینو شایەدی بە درۆو دوو زمانیو جنێودانو...هتد (رواهُ التِّرمذي، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صحيح) ئیمامی (تیرمزی) گێڕاویەتیەوە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (وَصَلاَةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿عَلَيْكُمْ بِقِيَامِ اللَّيْلِ فَإِنَّهُ دَأْبُ الصَّالِحِينَ قَبْلَكُمْ، وَهُوَ قُرْبَةٌ إِلَى رَبِّكُمْ، وَمَكْفَرَةٌ لِلسَّيِّئَاتِ، وَمَنْهَاةٌ لِلإِثْمِ، وَمَطْرَدَةٌ لِلدَّاءِ عَنِ الْجَسَدِ﴾ رواهُ التِّرمذي وأحمد، ئێوە شەونوێژ بکەن، چونکە شەونوێژ پیشەی پیاوچاکانی پێش ئێوەیە، لە خوا نزیکتان ئەکاتەوە، خراپەکانتان ئەسڕێتەوە، لە گوناهکردن قەدەغەتان ئەکا، دەرد لە لاشەتان دەر ئەکا.

٢- (وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ): ئیمامی (الأذرَعي) ئەو فەرموودەیەی هەڵبژاردوە: کە (جهاد) لە هەموو کردەوەکانی مرۆڤ -لە پاش ئیمان- گەورەترە، چونکە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا: ﴿يَا رَسُولَ اللهِ مَا يَعْدِلُ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللهِ؟ قَالَ: لاَ تَسْتَطِيعُونَهُ. فَأَعَادُوا عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا؟ كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: لاَ تَسْتَطِيعُونَهُ!. ثُمَّ قَالَ: مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْقَانِتِ بِآيَاتِ اللهِ لاَ يَفْتُرُ مِنْ صَلاَةٍ وَلاَ صِيَامٍ حَتَّى يَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللهِ﴾ رواهُ الشَّيْخَان، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام کردەوە بە قەد (جهاد) خێری زۆرە؟ فەرمووی: ناتوانن کردەوەی وا بکەن کە بە قەد (جِهادْ) خێری زۆر بێ. ئینجا دوو جارو سێ جاریتر پرسیاریان لێکردوەوە؟ ئەویش هەر ئەیفەرموو: ناتوانن. ئینجا فەرمووی: خێری (مُجاهِدْ) لە ڕێگای خوا، وەکو خێری ئەو کەسەیە: بەردەوام بەڕۆژوو بێو شەو نوێژ بکاو قورئان بخوێنێ، بە جۆرێکی وا: لە نوێژو ڕۆژوو پشوو نەدا، تا (مُجاهِدْ)ی ڕێگای خوا لە (جِهاد)ەکەی ئەگەڕێتەوە.

## ( اَلْحَدِيثُ الثَّلاثُون: أَوامِرُ اللهِ وَنَواهِيه )

﴿ عَنْ أَبِى‌ثَعْلَبَةَ الْخُشَنى جُرْثُومِ ابنِ ناشِر رضي الله عنه: عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: إنَّ اللهَ تَعالَى فَرَضَ فَرَائِضَ فَلاَ تُضَيِّعُوها، وَحَدَّ حُدُوداً فَلاَ تَعْتَدُوها، وَحَرَّمَ أَشْياءَ فَلاَ تَنْتَهِكُوها، وَسَكَتَ عَنْ أَشْياءَ رَحْمَةً لَكُمْ غَيْرَ نِسْيان

---

هەروەها پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كردو گوتی: ﴿يَا رَسُولَ اللهِ أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللهِ أَتُكَفَّرُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ، إلاَّ الدَّيْنَ﴾ رواهُ مُسْلِم، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەگەر لە ڕێگای خوا بكوژرێم‌و شەهید ببم، هەموو گوناهەكانم لائەبردرێن؟ فەرمووی: بەڵێ، بەو مەرجەی: خۆڕاگر بی‌و پاداشتت لە خوا بوێ‌و هەڵمەتبەر بی‌و هەڵاتوو نەبی، تەنها قەرز نەبێ. واتە: جگە لە قەرزی ئادەمیزاد، خوای گەورە لە گشت گوناهەكانی (شَهید) خۆش ئەبێ.

### ﴿ حەدیسی سی‌یەم: فەرمان‌و قەدەغەكراوەكانی خوا ﴾

(عَنْ أَبِى‌ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِى جُرْثُومِ ابنِ ناشِر) رضي الله عنه (ئەبو ثەعلەبە)ی (خوشەنی) یەكێكە لەو سەحابانەی پەیمانی بن دارەكەیان داوەتە پێغەمبەر ﷺ، (٤٠) حەدیسی گێڕاونەوە، لە ساڵی (٧٥)كۆچی لە شام وەفاتی كردوە.

(عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ) لە پێغەمبەر ﷺ ئەگێڕێتەوە: (قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إِنَّ اللهَ تَعالَى فَرَضَ فَرَائِضَ) خوای گەورە چەند شتێكی لە سەر ئێوە واجب كردوە (فَلاَ تُضَيِّعُوها) ئێوەش لە دەستیان مەدەن‌و جێ‌بەجێیان بكەن.

**پێناسە:** واجب ئەوەیە: لە سەر كردنی پاداشی بدرێتێ‌و لە سەر نەكردنی سزا بدرێ: وەك نوێژ، ڕۆژوو، زەكات...هتد.

(وَحَدَّ حُدُوداً) وە خوای گەورە چەند سنورێكی داناوە: بۆ سزادانی خەڵك لە سەر هەندێك تاوان (فَلاَ تَعْتَدُوها) لەو سنورە تێمەپەڕن‌و زیاتری مەكەن وەك سزای (زینا): سەد دارە، سزای ئارەقخۆر: چل دارە، بوختان: هەشتا دارە...هتد، بەو جۆرەی لە شەریعەتی‌ئیسلام دیار كراوە.

(وَحَرَّمَ أَشْياءَ) خوای گەورە چەند شتێكی قەدەغە كردوەو حەرامە بیكەن (فَلاَ تَنْتَهِكُوها) قەدەغەی خوا مەشكێنن‌و نزیكی ئەو حەرامە مەكەون، بە هیچ جۆرێ مەیكەن، وەك زینا، ئارەق، قومار، شایەدی بە درۆ...هتد.

**پێناسە:** حەرام ئەوەیە لەسەر كردنی سزا بدرێ‌و بە وازلێهێنانی پاداشتی بدرێتێ لە قیامەت.

(وَسَكَتَ عَنْ أَشْياءَ) خوای گەورە بێدەنگی‌ی لە هەندێ شت كردوەو باسی حەرام‌و حەڵاڵی ئەو شتەی نەكردوە (رَحْمَةً لَكُمْ) بەزەیی بە ئێوەدا هاتوە (غَيْرَ نِسْيانٍ) وا تێمەگەن خوا

فَلاَ تَبْحَثُوا عَنْها ﴾ حَدِيثٌ حَسَنٌ رواهُ الدّارَقُطْنِي وَغَيْرُهُ.

له بیری چووه باسی بکا (فَلاَ تَبْحَثُوا عَنْها) ئێوەش لێی مەکۆڵنەوەو بە دوایا مەگەڕێن. کەواتە: پرسیاری زیاد مەکەو مەڵێ ئەرێ بۆچی حەرامە؟ بۆچی حەڵاڵە؟ بەلام ئەگەر شتێکت لە لا ڕوون نەبو ئایا حەرامە، یان حەڵاڵە؟ بڕۆ لای زانایئاینی پرسیار بکەو بە نەزانی ئیشەکە مەکە.

(حَدِيثٌ حَسَنٌ، رواهُ الدّارَقُطْنِي وَغَيْرُهُ) ئیمامی (دارەقوتنی)و چەند زانایەکیتر گێڕاویەتیانەوە، ئەم زانایە ناوی (علی) کوڕی (عمر)ە خەڵکی گەڕەکی (دارُالْقُطن) بوو لە (بەغدا)، لە ساڵی (٣٠٦)کۆچی لە دایك بووە، لە (٣٨٥) وەفاتی کردوە، یەکێکە لە زانا بەرزەکانی حەدیس.

**ئینجا بزانە:** هەر کەسێك کردەوەیەکی حەرام بکا، ئەوە توڕەیی خوا ئەبزوێنێ بۆ ئەوەی سزای بدا ﴿عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيﷺ قالَ: إنَّ اللهَ يَغارُ وَالْمُؤْمِنُ يَغارُ، وَغَيْرَةُ اللهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ اللهُ﴾ رواهُ التِّرمذي، واتە: خوا غیرەتی هەیەو توڕە ئەبێ، موسوڵمانیش غیرەتی هەیەو توڕە ئەبێ، جا غیرەتو توڕەبوونی خوا بە هۆی ئەوەیە: کە موسوڵمان کردەوەیەکی حەرام بکا.

﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (إنَّ اللهَ تَعالَى فَرَضَ فَرَائِضَ فَلاَ تُضَيِّعُوها): **بزانە:** هەر کەسێك واجبێکی لە دەست چوو لە کاتی خۆیدا نەیکرد، واجبە قەزای بکاتەوە، چونکە ڕستەی (فَلاَ تُضَيِّعُوها) وا ئەگەیەنێ: هەر کەسێك بمرێو واجبێکی لە ئەستۆدا مابێ، ئەوە بە لە دەستدەری مافی خوا ناو ئەبرێ، کەوابوو: هەر کەسێك واجبێکی لە ئەستۆدا بێ، دروست نیە خۆی بە سوننەت خەریك بکا، تا واجبەکە ئەداتەوە، لە حەدیسی پێغەمبەرداﷺ هاتوە: ﴿لاَ تُقْبَلُ نَافِلَةٌ حَتَّى تُؤَدَّىالْفَرِيضَةُ﴾ رواه الإمام أحمد في رسالة الصلاة، لە لای خوا سوننەت قبوڵ ناکرێ، تا واجب بە تەواوی ئەکرێ.

٢- (وَحَرَّمَ أَشْياءَ فَلاَ تَنْتَهِكُوها): شکاندنی قەدەغەیخوا بە هێزترین هۆیە: بۆ توڕەبوونی خوا، چونکە کردنی هەر کارێکی حەرام ئەبێتە نیشانەی بێبایەخیو ڕێز لێنەنان لە خوای گەورە، تەماشا بکە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ أَحَدَ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ، فَلِذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْها وَمَا بَطَنَ﴾ رواهُ الشَّيْخان، هیچ کەس لە خوا بە غیرەتتر نیە، لە بەر بەغیرەتی تاوانی ئاشکراو پەنهانی حەرام کردوە. واتە: هەر کەسێك تاوانێك بکا، خوا لێی توڕە ئەبێ.

٣- (فَلاَ تَبْحَثُوا عَنْها): یەکێك لەو شتانەی خواو پێغەمبەرﷺ بێدەنگیان لێکردوە: زاتی خوای گەورەیە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿تفكَّرُوا فِي آلاَءِ اللهِ، وَلاَ تَفكَّرُوا فِيالله﴾ رواه

## (اَلْحَديثُ الْحادي والثَّلاثُون: في الزُّهْد)

﴿ عَنْ أَبِي العَبَّاس سَهْلِ بن سَعْدالسَّاعديِّ رضي الله عنه قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبيِّ ﷺ، فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا عَمِلْتُهُ أَحَبَّنِي اللهُ وَأَحَبَّنِي النَّاسُ؟ فَقَالَ ﷺ: ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللهُ، وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ النَّاسِ يُحِبَّكَ النَّاسُ ﴾ حَديثٌ حَسَنٌ رواهُ ابنُ ماجه وَغَيْرُهُ بِأَسانيدَ حَسَنَة.

---

الطبراني والبيهقي، بیر لـه چاکەکانو دروستکراوەکانی خـوا بکەنـەوە، بـیر لـه زاتیخـوا مەکەنەوە. کەوابوو: گفتوگۆ کردن دەربارەی زاتـی خـوا، شـوێنی خـوا، نهێنیـیەکانیخوا، پیشەی گومڕابووەکانی (أَهْلُ البِدْعَة وَالضَّلالَة)یە.

### ﴿ حەدیسی سیو یەکەم: وازهێنان لە دونیا ﴾

(عَنْ أَبِي العَبَّاس سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِي) رضي الله عنه (سـەهل)ی کـوڕی (سـەعد)ی (سـاعیدی) خـوا لێیان ڕازی بێ، سەحابەیە، خـەڵکی (مەدینـە)یـە، (١٨٨) حەدیسـی گێڕاونـەوە، لـە سـاڵی (٨٨)ی کۆچی لە (مەدینە) وەفاتی کردوە.

(قَالَ) ئەفەرموێ: (جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ) پیاوێك هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ (فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ) پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکم پێ نیشان بدە (إِذَا عَمِلْتُهُ) هەر کاتێك ئەو کارەم کرد (أَحَبَّنِي اللهُ وَأَحَبَّنِي النَّـاسُ) خـوای گـەورە خۆشـی بـوێمو خـەڵکیش خۆشی بوێم؟.

(فَقَالَ: ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: واز لە دونیا بێنەو تـەنها بـە قـەد پێویست ماڵیحەلاڵ کۆ بکەوە–بڕوانە حەدیسی (٤٠)– (يُحِبَّكَ اللهُ) خوای گەورە خۆشی ئەوێ.

**وازهێنـان لـە دونیا** ئەمەیـە: چـاوت لـە گـەورەیی نـەبێ، خـۆت بـە پیـاوێکی زلو لێهـاتوو دانەنێی، ئەوەی دڵت ئەیەوێ لە حـەلاڵ گشـتی نـەدەیتێ، چـاوت لـە دەسـتی کـەس نـەبێ، هەردەم مردن لە بەرچاوت بێ، گیانیخۆت بە خواپەرستی ببەیتە سەر.

(وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ النَّـاسِ) واز لـەو شـتانە بێنـە: کـە لـە بەردەسـتی خەڵکدایـە (يُحِبَّكَ النَّـاسُ) خەڵکیش ئەتۆی خۆش ئەوێ، چونکە دڵی زۆر کەس ئەوهایە: ئەگەر تەماع لە ماڵیان بکـەی، یان تەماع لە کاریان بکەی ڕقیان لێت هەڵئەستیو خۆشیان ناوێیو بە چاوی سوك تەماشات ئەکەن، کەوابوو: خۆشویستنی دونیـا سـەری هـەموو تاوانێکـە، هـەر کەسـێك دونیـای خـۆش بـوێ، لـە دوا ڕۆژدا زیـانی لێئەکـەوێ، مرۆڤـی ژیـرو هۆشـیار بـۆ چـەند ڕۆژێکـی دونیـا خـۆی ناشیرین ناکا لە لای خواو خەڵك.

(حَدِيثٌ حَسَنٌ، رواهُ ابنُ ماجـه وَغَيْـرُهُ بِأَسـانِيدَ حَسَـنَةٍ) حەدیسـێکی جوانـە، ئیمـام (ئـیبن ماجە)و چەند زانایەکیتر گێڕاویەتیانەوە.

(ئیبن ماجە) ناوی (محمد) کوڕی (یەزید) بوو، خەڵکی (قەزوێن) بـوو، لـە سـاڵی (٢٠٩)یکۆچـی لە دایك بووە، لە (٢٧٣) وەفاتی کردوە، یەکێکە لە زانایانی حەدیس، خوا لێی ڕازی بێ.

## (اَلْحَدِيثُ الثّانِي والثَّلاثُون: لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ)

﴿عَنْ أَبِي سَعِيد سَعْد بن مَالِك بن سِنَان الْخُدرِي رضي الله عنه:

**ئینجا بزانە:** سووربوون لە سەر وەدەستهێنانی ماڵی دونیاو هەوڵدان بۆ پلەیبەرز ئەبێتە هۆی لە دەستچوونی زۆر لە پلەی لە خواترسانو خواپەرستی، چونکە ئەم دڵە جێگای دوو هەوێی تێدا نابێتەوە ﴿عَنْ كَعْب بن مَالك رضي الله عنه: عَنِ النَّبي ﷺ قَالَ: مَا ذِئْبَان جَائعَان أُرْسِلاَ فِي غَنَمٍ بأَفْسَدَ لَهَا مِنْ حِرْصِ الْمَرْءِ عَلَى الْمَالِ وَالشَّرَف لدينه﴾ رواهُ الإمام أحمد، واتە: دوو گورگی برسی کە بەربدرێنە ناو مێگەلە مەڕێك، ئەوەندە تێکی نادەن، وەکو سووربوونی مرۆڤ لە سەر کۆکردنەوەی ماڵو وەدەستهێنانی گەورەیی ئایینەکەی لێ تێك ئەدا.

### ﴿چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا﴾

١- (ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿أُنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلُ مِنْكُمْ وَلاَ تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لاَ تَزْدَرُوا نِعْمَةَاللهِ عَلَيْكُمْ﴾ رواهُ مُسْلم، تەماشای ئەو کەسە بکەن کە لە ئێوە بەرەو خوارترە: لە خزمو ماڵو جوانی، تەماشای ئەو کەسە مەکەن کە لە ئێوە بەسەرەوەترە: لە خزمو ماڵو جوانی، وەها باشترە، تاکو نیعمەتەکانی خواتان بە سوکی نەیەتە بەرچاو.

٢- (ازْهَدْ فِيمَا عِنْدَالنَّاس): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿اتَّقِ الْمَحَارِمَ تَكُنْ أَعْبَدَ النَّاسِ، وَارْضَ بِمَا قَسَمَ اللهُ لَكَ تَكُنْ أَغْنَىالنَّاسِ، وَأَحْسِنْ إِلَى جَارِكَ تَكُنْ مُؤْمِنًا، وَأَحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ تَكُنْ مُسْلِمًا، وَلاَ تُكْثِرِ الضَّحِكَ فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ﴾ رواهُ التِّرمذي، واتە: خۆت لە حەرامەکان بپارێزە ئەبیتە خواپەرسترین کەس، ئەو بەشەی خوا بۆی داناوی پێی ڕازیبە ئەبیتە دەوڵەمەندترین کەس، چاکە لەگەڵ دراوسێت بکە ئەبیتە ئیمانداریکی تەواو، زۆر پێمەکەنە چونکە زۆر پێکەنین دڵ ئەمرێنێ.

٣- (يُحِبَّكَ اللهُ.. يُحِبَّكَ النَّاسُ): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ تَعالَى يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلاَلِي؟ اَلْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّي﴾ رواهُ مُسْلم، خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی ئەفەرموێ: لە کوێن ئەوانەی لە دونیادا لە بەر گەورەیی من یەکترییان خۆش ئەویست؟ ئەمرۆ لە سێبەری عەرشیخۆمیان دائەنێم، کە جگە لە سێبەری عەرشیخۆم هیچ سێبەرێکیتر نیە.

### ﴿ حەدیسی سیو دووەم: زیان لە ئیسلامدا نیە ﴾

(عَنْ أَبِيسَعِيدِ سَعْدِ بن مالِك بنِ سِنانِ الْخُدري) رضي الله عنه (ئەبو سەعید)ی (خودری) یەکێکە لە سەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ، (١١٧٠) حەدیسی گێڕاوەتەوە، لە ساڵی (٧٤)ی کۆچی لە (مەدینە) وەفاتی کردوە، بە خۆیشی خەڵکی (مَدِينَة) بووە.

أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: لاَ ضَـرَرَ وَلاَ ضِـرَارَ ﴾ حَـديثٌ حَسَـنٌ رواهُ ابـنُ ماجـه وَالدّارَقُطْنِي وَغَيْرُهُما مُسْنَداً، وَرَواهُ مالكُ فِيالْمُوطّأ مُرْسَلاً عَنْ عَمْـرو بـنِ يَحْيَـى عَنْ أَبِيه عَنِ النَّبيِّﷺ، فَأَسْقَطَ أَباسَعيد وَلَهُ طُرُقٌ يُقَوِّى بَعْضُها بِبَعْض.

---

ئـەم (صـحابه)يـە ئەگێڕێتـەوە: (أَنَّ رَسُـولَ اللهِﷺ قَـالَ) پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: (لاَ ضَـرَرَ) هـيچ زيـان لێدانێك لـە ئاييـنیئيسـلامدا ڕەوا نيـە: چ زيـان لـە خـۆت بـدەی، چ لە كەسێكیتر بۆ ئەوەی سود بە خۆت بگا.

(وَلاَ ضِرَارَ) هەروەها: زيان لێدانی خەڵك ڕەوا نيـە، بـا سـودی خۆيشـی تـێدا نـەبێ، يـان لە تۆڵەی زيانێك زيانێكیتری بێشەرعی لێبدەی، واتە: لـە مـافی خـۆی زۆرتـر زيـانی لێبدا: وەك لەجياتی پەنجەيەك دەستی ببڕێ، يان لەجياتی دەستێك بيكـوژێ، واتـە: لـە سـنوری ئيسلام دەرچێ.

بەڵام ئەگەر بەرژەوەندی گەورەتر بـوو لـەو زيانـە، ئەمـە ڕەوايـە: وەك دەسـت بـڕينی دز بـۆ پاراستنی ماڵی خەڵك، داركاریكردنی زيناكەر بۆ پاراسـتنی نـاموس، يـان تۆڵـە وەرگرتنێكـی بەگوێرەی شەرعیئيسلام بوو: وەك چاو بە چاو، دەست بە دەست، ئەمەش ڕەوايە.

(حَديثٌ حَسَنٌ، رواهُ ابنُ ماجه وَالدّارَقُطْنِي وَغَيْرُهُمـا مُسْنَداً) حەديسـێكی جوانـەو ئيمـام (ئيبن ماجه)و (دارەقوتنی)و چەندانیتر گێڕاويەتيانەوە (وَرَواهُ مالكُ فِي الْمُوطّأ مُرْسَـلاً عَـنْ عَمْرو بنِ يَحْيَى عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبيِّﷺ فَأَسقط أباسعيد) هەروەها ئيمام (ماليك) -كوڕی (ئەنەس) يەكێكـە لە زانا سەرمەزهەبەكانو زانايانی حەديس، لە ساڵی (٩٣) لە (مەدينە) لە دايك بـووە، لـە سـاڵی (١٧٩)ی كۆچی لە (مەدينە) وەفاتی كردوە، مامۆستای ئيمامی (شافعی) بوو، خـوا لێيـان ڕازی بـێ- ئـەو حەديسـەی لـە كتێبەكـەی خـۆی كـە نـاوی (مُوطّأ) بـوو، گێڕاويەتيـەوەو نـاوی (ئەبوسەعيد)ی نەهێناوە، كەوابوو: حەديسەكە لاوازە، بەڵام (وَلَـهُ طُـرُقٌ يُقَـوِّى بَعْضُـها بِـبَعْضٍ) حەديسەكە چـەند ڕێگايـەكی هەنـە: يـەكتری بـەهێز ئەكـەنو حەديسـەكە جـوان ئـەبێو ئيشـی پێئەكرێ، يەكێك لەم ڕێگايانە ئەم حەديسەيە:

﴿عَنْ أَبِيصِرْمَةَرضي الله عنه أَنَّ رسول اللهِﷺ قَالَ: مَنْ ضَارَّ ضَارَّ اللهُ بِهِ وَمَنْ شَاقَّ شَاقَّ اللهُ عَلَيْـهِ﴾ رواهُ التّرمذی بسند حسن، واتە: هەركەسێك زيان بە خـەڵكی بگەيـەنێ خـوا زيـانی پێئەگەيـەنێ، وە هەركەسێك ئازارو بارگرانی بخاتە سەر خەڵكی خوا لە قيامەت باری گران ئەكا.

### ﴿ چەند تێگەيشتنێك لەم حەديسەدا ﴾

**بزانە:** زانايانی شەرعزان لە سەر بناغـەی ئـەم حەديسـەی (لاَ ضَـرَرَ وَلاَ ضِـرَارَ) چـەند (قاعدة)يەكی (أُصولُ الفِقْه)یيان بنيات ناوە، وەكو:

١- (الضَّرَرُ يُزالُ) ئەبێ زيان لابدرێ: وەكـو گەڕاندنـەوەی شـتی فرۆشـراو ئەگـەر ناتـەواو بوو، هەم خۆپاراستن لە هۆيەكانی نەخۆشیو...هتد.

## (اَلْحَدِيثُ الثّالث والثّلاثون: في كَيْفِيَّة الْمُحاكَمَة)

﴿ عَنْ ابْنِ عبَّاسٍ رضى الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لاِدَّعَى رِجَالٌ أَمْوَالَ قَوْمٍ وَدِمائَهُمْ، لَكِنِ الْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ ﴾

---

٢- (اَلضَّرَرُ لاَ يُزَالُ بِالضَّرَرِ) نابێ زیان به زیانێکیتر لابدرێ، وەکو: دروست نیه مرۆڤی برسی خواردنی برسیێکیتر بخواو تووشی مردنی بکا، دروست نیه ڕووبار له زەویەکەی خۆی لابداته زەوی کەسێکیتر...هتد.

٣- (يُتَحَمَّلُ الضَّرَرُ الْخاصُّ لِدَفْعِ الضَّرَرِ الْعامِّ) زیانی تایبەتی لێئەدرێ تاکو زیانی گشتی لابدرێ: وەکو بڕینی دەستیدز، تاکو زیان له ماڵی خەڵك نەکەوێ...هتد.

٤- (يُرْتَكَبُ أَخَفُّ الضَّرَرَيْنِ لإتِّقاءِ أَشَدِّهِما) زیانی سوکتر لێئەدرێ تاکو له زیانی گەورەتر خۆ بپارێزرێ: وەکو له دەستدانی ماڵ بۆ پاراستنی گیانیخۆی، یان هی ئادەمیزادێکیتر، هەم شکاندنی ڕۆژوو بۆ ڕزگارکردنی گیانیخۆی، یان هی ئادەمیزادێکیتر...هتد.

٥- (اَلضَّرُوراتُ تُبِيحُ الْمَحْظُوراتِ) ناچاریەکان حەرامەکان حەڵاڵ ئەکەن: وەکو خواردنی مردار بۆ مرۆڤی برسی که نزیك مردن بێ، هەم گوتنی ووشەی کوفر، یان کردنی کارێکی کوفر ئەگەر زۆری لێکراو مەترسی کوشتنی هەبوو.

**ئاگاداری**: ناچاری=(ضَرُورَة) لەگەڵ پێویستی=(حَاجَة) جیاوازە، چونکه ناچاری=(ضَرُورَة) به حاڵەتێك ئەگوترێ: که نزیکی مردن بکا، ئەم ناچاریە حەرام حەڵاڵ ئەکا.

پێویستی=(حَاجَة) به حاڵەتێك ئەگوترێ: که زۆر ماندوو و به ئازاری بکا، بەڵام مەترسی مردنی لێنەکرێ، کەوابوو: بەم پێویستیە حەرام حەڵاڵ نابێ.

### ﴿ حەدیسی سیو سێیەم: چۆنیەتی دادکردن ﴾

(عَنْ ابْنِ عبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ) له (ئیبن عەبباس) خوا لێیان ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لَوْ يُعْطَى النَّاسُ) ئەگەر بدرێ به خەڵك، واتە: ئەو مافەی داوای ئەکەن ئەگەر بیاندرێتێ (بِدَعْوَاهُم) به تەنها داواکردنیان (لإِ دَّعَى رِجَالٌ أَمْوَالَ قَوْمٍ) هەندێ کەس لەخۆیەوە داوای ماڵی خەڵکیتری ئەکرد (وَدِمائَهُمْ) وە داوای خوێنی کەسانیتریشیان ئەکرد، واتە: کوشتن.

(لَكِنْ) بەڵام ئاینی پیرۆزیئیسلام وای داناوە: که (اَلْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي) داواکار شاهید بێنێ بۆ ئەوەی ڕاستیەکەی دەرکەوێ؟ چونکه ئەو داوای شتێکی پەنهان ئەکا: که ئەو مافەیە (وَالْيَمِينُ) سوێندخواردن (عَلَى مَنْ أَنْكَرَ) له سەر ئەو کەسەیە که داوای لێکراوەو دان نانێ به مافی داواکار.

حَديثٌ حَسَنٌ رواهُ البَيْهَقي وَغَيْرُهُ هَكَذَا، وَبَعْضُهُ فِي الصَّحِيحَيْن.

(حَـديثٌ حسَـنٌ رواهُ الْبَيْهَقِـى) ئيمـامى (بەيهـەقى) –نـاوى (أحمـد) كـوڕى (حسـين)، لـە (بەيهەق) لە نزيك (نيسابور) لـە سـاڵى (٣٨٤)ى كۆچـى لـە دايك بـووە، يەكێكـە لـە زانـا بەرزەكانى حەديس، لە ساڵى (٤٥٨) وەفاتى كردوە– ئەم حەديسەى گێڕاوەتـەوە (وَغَيْـرُهُ هَكَذَا) چەندانىتريش بەو جۆرە گێڕاويەتيانەوە (وَبَعْضُهُ فِى الصَّحِيحَيْنِ) پارچـەيەكى ئـەم حەديسە لە (صحيح)ى (بوخارى)و (موسليم)دايە.

**مەرجى شاهيدەكان:** ئەبى موسوڵمان بن، نوێـژو ڕۆژوو و زەكـات جێبـەجێ بكـەن، تاوانبـار نەبن: بە ئارەقو قومارو زينا...هتد گوناهەكانىتر، هەروەها: دايكو باوكو كوڕو كچى داواكـار نەبن، دوژمنى داواليكراو نەبن، ڕەووشتيان بـاش بـێ، گومـانى سـوود بـەخۆ گەيانـدنو زيـان لادان لە سەر خۆيان لێنەكرێ.

**سوێندخواردنيش:** ئەبى بە خودا بێ، يان بە سيفەتەكانى خودا بێ: وەك قورئانى پيرۆز.

**ئينجا بزانە:** ئەگەر داواكار دوو شاهيدى هێنان، يان شـاهيدێكى هێنـاو سوێنديشـى خـوارد، ئەوە مافەكەى ئەدرێتێ، وە ئەگەر هيچ شاهيدى نەهێنا، ئەو كاتە داواليكـراو سـوێند ئـەخوا: كە ئەو مافەى لە سەر نيە. بەڵام داواليكراو بۆى دروسـتە: سـوێند نـەخواو بيگەڕێنێتـەوە بۆ سەر داواكـار، بۆ ئـەوەى ئـەو سـوێند بخـوا، جـا ئەگـەر داواكـار شـاهيدى نـەهێناو سـوێندە گەڕايەوەكەشى نەخوارد، ئەوە بە يەكجارى مافى ئەسـوتێ، واتـە: ئـەبى بـە جـۆرێكىتر ئـەم داوايە تۆمار بكا، بەو مەرجەش شاهيدى دەست بكەوێ.

**جا ئەوەش بزانە:** واجبە كاربەدەست قازىيەك دابنێ بۆ بڕاندنـەوەى كێشـەى نێـوان خـەڵك، ئەگەر ئەو داينەنا، ئەبى خەڵكەكە بۆ خۆيان يەكێك دابنێنو گوێڕايەڵى بن ﴿عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِي ﷺ: كَيْفَ تُقَدَّسُ أُمَّةٌ لاَ يُؤْخَذُ مِنْ شَدِيدِهِمْ لِضَعِيفِهِمْ﴾ رواهُ ابنُ حِبّان، واتە: چۆن پـاكو سەرفراز ئەبێ گەلێكى وا: كە مافى بێهێزەكانيان لە بەهێزەكانيان وەرنەگيرێ.

## ﴿ چەند تێگەيشتنێك لەم حەديسەدا ﴾

١– (لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُم): پێغەمبەرﷺ ئەفـەرموێ: ﴿مَنْ خَاصَمَ فِي بَاطِـلٍ وَهُـوَ يَعْلَمُهُ، لَمْ يَزَلْ فِي سَخَطِ اللهِ حَتَّى يَنْزِعَ عَنْهُ﴾ رواهُ أبـوداود، هەركەسێك داواى شـتێكى ناهەق بكاو بشزانێ: مافى لەو شتەدا نيە، بەردەوام لە توڕەيى خوادا دەمێنێتەوە، تـا واز لەم داوايە ئەهێنێ.

٢– (اَلْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿لَنْ تَزُولَ قَدَمَا شَاهِدِ الزُّورِ حَتَّى يُوجِبَ اللهُ لَهُ النَّارَ﴾ رواهُ ابن ماجە، قاچى شاهيدى بە درۆ لە شوێن خۆى لاناچێ، تا خواى گەورە بڕيارى دۆزەخى بۆ ئەدا. چونكە شـاهيدىى بـە درۆ وەكـو كـافربوون دانـدراوە، كـەوابوو: خۆتى لێبپارێزەو شاهيدى بە درۆ مەدە.

(اَلْحَدِيثُ الرّابع والثّلاثُون: في إزالَة الْمُنْكَر)

﴿عَــنْ أَبِي سَــعِيدالْخُدْرِيﷺ قــالَ: سَــمِعْتُ رَسُــولَ اللهِﷺ يَقُــولُ: مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ،

---

٣- (وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ فَقَدْ أَوْجَبَ اللهُ لَهُ النَّارَ، وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ، قَالَ: وَإِنْ كَانَ قَضِــيبًا مِــنْ أَرَاكٍ﴾ رواهُ مُسْلِم، هەر کەسێك مافی موسوڵمانێك لە دەست بدا بە سوێندی بە درۆ، بەڕاستی خوای گەورە بڕیاری ئاگری دۆزەخی بۆ ئەداو بەهەشتی لێقەدەغە ئەکا، هەرچەند شوڕکە دارسیواکێکیش بێ.
واتە: مافەکە زۆر کەمیش بێ، کەوابوو: سوێندی بە درۆ مەخۆ.

## ﴿ حەدیسی سی و چوارەم: لابردنی بێشەرعی ﴾

(عَنْ أَبِي سَعِيدِالْخُدْرِي قَـالَ:)ﷺ (ئەبوسەعید)ی (خودری) ئەفەرموێ: (سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ) گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو (يَقُولُ) ئەیفەرموو: (مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا) هەر کەسێك لە ئێوە زانی شتێکی ناڕەوا هەیە (فَلْيُغَيِّرْهُ) با ئەم شتە ناڕەوایە لە ناو بەرێو بیگۆڕی (بِيَدِهِ) بە هێزی دەستو بازووی.

**بزانە:** مەبەست بە (مُنْكَر) واتە: ناڕەوا، وازهێنانە لە شتێك کە خواو پێغەمبەرﷺ واجبی کردبێ. یان کردنی شتێکە کە خواو پێغەمبەرﷺ حەرامی کردبێ: وەکو زیناو ئارەق خواردنو ڕیبا خواردنو خۆ ڕووتکردنی ئافرەتو تێکەڵی ئافرەتو پیاو، بە هەر جۆرێ هەبێ...هتد. ئەمانە هەمووی لە ئیسلامدا ناڕەوایەو پێویستە هەموو موسوڵمانێك بەهێزو توانای خۆی ئەو شتە نارێکە لەناو بەرێ، بەو مەرجەی: تووشی کوشتنی خۆیو کەسێکیتر نەبێو تووشی نامووس بردنی خۆیو کەسێکیتر نەبێو تووشی لەناوبردنی ماڵی نەبێ، (ئەمە مەرجی واجببوونە).

بەڵام ئەگەر ناڕەوایەکە لە ناو ئەچوو تەنها ئەویش مەترسی لەناوچوونی خۆی هەبوو، ئەوە سوننەتە لایببا، تاکو شەهید ببێ، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ حَمْزَةُ، وَرَجُـلٌ قامَ إِلَى سُلْطَانٍ جائِرٍ فَأَمَرَهُ وَنَهَاهُ فَقَتَلَـهُ﴾ رواهُ الحاكم، گەورەی شەهیدان (حەمزە)ی مامی پێغەمبەرەﷺ، پیاوێکیشە: کە ڕووبەڕووی کاربەدەستێکی ستەمکار ببێتەوە فەرمانی بە چاکەی پێبکاو لە خراپە قەدەغەی بکا، جا ئەویش بیکوژێ.

بەڵام ئەگەر گەیشتە ئەو ڕادەیە تاوانباران چەك بە کار بێننو بە ئاشکرایش گوناهیان ئەکرد، ئەبێ فەرمانڕەوای موسوڵمانان بەو ئیشە هەڵستێ، جا ئەگەر هاتو کاربەدەستان گوێیان بە خراپە نەئەدا، یان یارمەتی خراپەیان ئەدا –وەکو ئێستا لە وڵاتانیئیسلامدا هەیە– ئەوە کار لەوە دەرئەچێو ئەگاتە پلەی تێکۆشانی چەکدارانە: موسوڵمانانی لێهاتوو خۆیان ڕێك ئەخەنو یەك ئەگرن بۆ نەهێشتنی ئەم جۆرە کاربەدەستانەو بۆ ژیاندنەوەی حوکمی قوڕئان.

فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلسَانِه، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِه، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ﴾ رواهُ مُسْلِم.

جا ئەگەر دانیشتن، گوناهیش بە ئاشکرایی ئەکرا، ئەوە هەموویان گوناهبار ئەبن ﴿عَنْ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تَقْرَؤُونَ هَذِهِ الآيَةَ وَتَضَعُونَهَا فِي غَيْرِ مَوَاضِعِهَا: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ). وَإِنَّا سَمِعْنَا رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوُا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بِعِقَابٍ﴾ رواهُ أصحابُ السّنن، ئیمامی (ئەبوبەکر) فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە ئەخوێننو لە مەبەستێکیتر دایئەنێن، کە خوا ئەفەرموێ: (ئێوە خۆتان چاك بکەن، گومڕایی کەسانیتر زیان لە ئێوە نادا ئەگەر ئێوە ڕاست بن). جا فەرمووی: ئێمە گوێمان لە پێغەمبەر ﷺ بوو، ئەیفەرموو: هەر کاتێك خەڵك زۆردارو ستەمکاریان بینیو لە ستەمو زۆرداری قەدەغەیان نەکردو نەیانگێڕاوە بۆ ژێر حوکمی خوا، زۆر نزیکە خوای گەورە بە تێکڕایی گشتیان تووشی سزا بکا. بگەڕێوە بۆ حەدیسی (٢٩).

جا بە هەر جۆرێ هەبێ، ئیمڕۆ فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنیخراپە پێویستی بە تێکۆشانی چەکدارانە هەیە، چونکە یەکە یەکە موسوڵمانان هیچیان بۆ ناکرێو کاربەدەستەکانیش نۆکەری کوفرنو نایەڵن کەس فەرمان بە چاکە بکاو قەدەغەی خراپە بکا ﴿عَنْ كَعْبٍ رضي الله عنه: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّهُ سَتَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ مَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ وَلَيْسَ بِوَارِدٍ عَلَيَّ الْحَوْضَ﴾ رواهُ النّسائي والتّرمذي، واتە: لە دوای من چەند کاربەدەستێکی لێنەهاتوو دێنە سەر حوکم، جا هەرکەسێك باوەڕ بە درۆی ئەم کاربەدەستانە بکاو یارمەتییان بدا لە سەر ستەمکاری، ئەو کەسە لە ئوممەتی من نیە، منیش ڕابەری وی نیم، نابێتە میوانم لە سەر حەوزی کەوسەر.

(فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ) جا ئەگەر بە دەست نەیتوانی خراپەکە لە ناو بباو قەدەغەی بکا، لە بەر ئەوەی کەس یارمەتیی نەئەداو بە تەنها تووشی کوشتنی خۆیو ماڵوێرانی ئەبو، وە نەیئەویست خۆی شەهید بکا چونکە سودی نەبو (فَبِلِسَانِه) با بە زوبانیخۆی خراپەکە لە ناو بباو ئامۆژگاری خەڵکی بکاو بە قسەی ڕێكو جوان بیانهێنێتەوە سەر ڕێگای ڕاست، جا ئەگەر سودیشی نەبێ، ئەبی بە زوبان فەرمان بە چاکە بکاو باسی خراپە هەر بکا.

(فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ) جا ئەگەر بە زمانیش نەیتوانی فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە بکا، چونکە ئەخرایە بەندیخانە، یان لێی ئەدراو ناموسیان ئەبرد، کەسیش یارمەتیی نەئەدا (فَبِقَلْبِهِ) با بە دڵ پێی ناخۆش بێ (وَذَلِكَ) ئەم پێناخۆشیەی ناو دڵ (أَضْعَفُ الإِيمَانِ) لە هەموو ئیمانێك نزمترو کزترە. چونکە ئەگەر ئیمانی بە تین بایە، بە دەستو بە زوبان قەدەغەی ئەکردو گوێی نەئەدایە سەرو ماڵی خۆی، مردنێك لە ڕێگای خوا بێ، باشترە لە ژیانێکی ناو تاوانباری (رواهُ مُسلِم) ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

ئینجا-لە حەدیسێکی‌تردا- پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿لە دوای ئەم ئیمانە بێ‌هێزە بە قەد دەنکە گلێرمیەك ئیمانی نامێنێ﴾. واتە: ئەگەر موسوڵمان بە دڵیش ڕقی لە خراپە نەبۆوە نیشانەی ئەوەیە: ئیمانی نەماوە.

**بزانە:** پێویستە پێش هەموو شتێك مرۆڤی موسوڵمان لە ماڵی‌خۆیەوە فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە دەست پێ‌بکا، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾ واتە: ئەی خاوەن باوەڕان خۆتان‌و منداڵو خێزانتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ. ئەی موسوڵمان: کە ئیمڕۆ بە چاوی خۆمان ئەبینین زۆر لە موسوڵمانان ژن‌و کچی ڕووتی لە بازاڕا ئەسوڕێتەوەو بە قەد دەنکە گلێرەیەك پێی سەخڵەت نابێ، ئایا بە تەرازووی ئەم حەدیس‌و ئایەتە بیکێشین چ موسوڵمانێکی لێ‌دەرئەچێ؟

**﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾**

١- (فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِه): **بزانە:** هەر کاتێك بە هۆی لابردنی (مُنْكَر) زیان لە کەسێکی‌تر ئەکەوت‌و زیانەکەش لە زیانی (مُنْكَر) زۆرتر بوو، ئەوە حەرامە فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە بکا، چونکە (**الضَّرَرُ لاَ يُزَالُ بِالضَّرَرِ**) زیان بە زیان لانابردرێ.

بەڵام: ئەگەر تەنها مەترسی لەناوچوونی خۆی، یان ماڵی خۆی هەبوو، ئەوە سونەتە: فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە بکا، ئینجا ئەگەر مەترسی خۆی‌و کەسێکی‌ترو ماڵ‌و ناموسی خۆی‌و کەسێکی‌تری نەبو، ئەوە واجبە فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە بکا، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِه، لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوف وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقاباً مِنْهُ ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلاَ يُسْتَجَابُ لَكُمْ﴾ رواهُ التِّرمذي، سوێندم بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە، ئەبی فەرمان بە چاکەو قەدەغەی خراپە بکەن، ئەگەر وا نەکەن نزیکە خوای گەورە لە لای خۆیەوە سزایەکتان بنێرێتە سەر خۆشی لە ژیانتان نەبینن، ئینجا لە خوداش بپاڕێنەوە، خودا دوعاتان قبوڵ ناکاو سزایەکە لانابا. واتە: چونکە کاری بێ‌شەرعی بەردەوامە.

٢- (فَبِلِسَانِه): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَفْضَلُ الْجِهادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطانٍ جائِرٍ﴾ رواهُ أصحاب السنن، گەورەترین (جیهاد)و تێکۆشان لە ڕێگای خوا: گوتنی ووشەیەکی ڕاست‌و دادپەروەرانەیە لە لای کاربەدەستێکی ستەمکار.

٣- (فَبِقَلْبِه): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِذَا عُمِلَت الْخَطِيئَةُ فِي الأَرْضِ كَانَ مَنْ شَهِدَهَا فَكَرِهَهَا كَمَنْ غَابَ عَنْهَا، وَمَنْ غَابَ عَنْهَا فَرَضِيَهَا كَانَ كَمَنْ شَهِدَهَا﴾ رواهُ أبوداود، هەر کاتێك گوناهێك لە سەر زەمین کرا، ئەو کەسەی لەو شوێنەیەو بە تاوانەکە ڕازی نیە، وەکو کەسێکە کە ئاگاداری گوناهەکە نەبێ، واتە: نابێتە هاوبەشی تاوانبارەکە، وە هەر

## ( اَلْحَدِيثُ الْخامس والثَّلاثُون: حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ )

﴿ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَحاسَدُوا وَلاَ تَناجَشُوا وَلاَ تَباغَضُوا وَلاَ تَدَابَرُوا وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ،

---

کەسێك لەو شوێنە نەبێو بە تاوانەکە ڕازی بێ، وەکو کەسێکە ئاگاداری گوناهەکە بێ، واتە: ئەبێتە هاوبەشی تاوانبارەکە لە تاوانەکەدا.

هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ رَضِيَ عَمَلَ قَوْمٍ كَانَ مِنْهُمْ﴾ أَخْرَجَهُ أَبُويعْلَى، هەر کەسێك بە کردەوەی گەلێك ڕازی بێ، ئەویش ئەبێتە یەکێك لەوانو هاوبەشی تاوانەکەیانە.

### ﴿ حەدیسی سیو پێنجەم: مافی موسوڵمان لە سەر موسوڵمان ﴾

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ) ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لاَ تَحَاسَدُوا) حەسوودی بە یەکتری مەبەن.

**پێناسە:** حەسوودی ئەمەیە: کە بتەوێ کەسێك شتێکیخۆی لە دەست بداو بۆ تۆ بێ. حەسوودی بۆیێ حەرامە؟ چونکە حەسوود ناڕەزایی بەرامبەر بە خوا دەردەبڕێ: کە شتێکی داوە بە کەسێکیتر، لە بەر ئەمە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (حەسوودی دین ئەتاشیو چاکەش ئەخوا). کەوابوو: ئەی موسوڵمان، بە دابەشکردنی خوا ڕازی بە، چونکە بە بێسود خۆت خەفەتبار ئەکەیو خوای گەورەش لێت ناڕازی ئەبێ.

(وَلاَ تَنَاجَشُوا) بە فێڵبازی پارەی فرۆشراو زیاد مەکەن، واتە: ئەگەر کەسێك شتێکی ئەکڕی، ئەتۆش نەچی بڵێی: من پارەی زۆرتر پێئەدەم. مەبەستیشت کڕین نەبێو بتەوێ کڕیار هەڵخەڵەتێنی تا بە پارەیەکی زۆرتر بیکڕێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ئەو کەسە مەلعونە کە زیان لە موسوڵمانێك بدا، یان فێڵی لێبکا﴾.

(وَلاَ تَبَاغَضُوا) ڕقو کینە لە یەك مەکێشن بۆ خاتری دونیا، واتە: ئەو جۆرە ئیشانە مەکەن کە ئەبنە هۆی ڕقو کینە: وەکو دووزمانیو گاڵتە بە یەکتریکردنو دەمەچەقەی بێسود...هتد (وَلاَ تَدَابَرُوا) پشت لە یەکتری مەکەنو دەنگ لە یەکتری ڕامەگرن.

**بزانە:** لە سێ ڕۆژ بەولاوە دروست نیە موسوڵمانان واز لە یەکتری بێننو قسە لەگەڵ یەکتری نەکەن، چونکە خوای گەورە چاکە لە هیچ لایەکیان وەرناگرێ تا ئاشت ئەبنەوە، باشترین لایەن لە ئیسلامدا ئەوەیە: کە ئەچی زوتر سەلام ئەکاو ئاشت ئەبێتەوە.

(وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ) هەندێك لە ئێوە کڕینو فرۆشتەنی مەکەن (عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ) بە سەر کڕینو فرۆشتەنی ئەوانیتردا وەك یەکێك بە فرۆشیار بڵێ: ئەو شتە مەفرۆشە بە فلانکەس، بیفرۆشە بە من، پارەت زیاتر ئەدەمێ. یان بڵێتە کڕیار: ئەو شتەی لێمەکڕەو بیدەوە، ئینجا من هەمان شتت ئەدەمێ بە هەرزانتر. ئەم جۆرە کردەوانە حەرامن.

وَكُونُوا عِبَادَاللهِ إِخْوَانًا، اَلْمُسْلِمُ أَخُوالْمُسْلِمِ: لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يَخْذُلُهُ وَلا يَكْذِبُهُ وَلاَ يَحْقِرُهُ، اَلتَّقْوَى هَاهُنَا-وَيُشِيرُﷺ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاثَ مَرَّاتَ- بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ﴾ رواهُ مُسْلِم.

---

(وَكُونُوا عِبادَ اللهِ إِخْوَانًا) ئەی بەندەکانی خوا، ئێوە ببنە برای یەکتری کاری وا بکەن کە ببن بە براو یەکتریتان خۆش بوێ.

(اَلْمُسْلِمُ أَخُوالْمُسْلِمِ) موسوڵمان برای موسوڵمانە (لاَ يَظْلِمُهُ) نابێ ستەمی لێبکا (وَلاَ يَخْذُلُهُ) نابێ سەرشۆڕی بکا. واتە: ئەبێ یارمەتی بداو لە هاواری بچێو نەیەڵێ کەس ستەمی لێبکا (وَلاَ يَكْذِبُهُ) نابێ درۆی لەگەڵ بکا لە هیچ بابەتێکا، بەڵام بۆ ئاشتکردنەوە درۆ کردن دروستەو بۆ پاراستنی موسوڵمانیش لە زۆردارێك دروستە.

(وَلاَ يَحْقِرُهُ) نابێ بە چاوی سوکو بێنرخ تەماشای بکەی، چونکە تۆ نازانی کامتان لە لای خوا بەڕێزن، کەوابوو: خۆشت بە زۆرو زڵ دامەنێ.

(اَلتَّقْوَى هَاهُنَا) ترسی خوا لە ناو ئێرەدایە (وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ) پێغەمبەرﷺ سێ جار دەستی خۆی لە سەر سینگیخۆی داناو هەر ئەیفەرموو: لە خواترسان لە ناو دڵدایە. واتە: ئەگەر دڵ گونجاو و باش بێ، هەموو کردەوکانیش باش ئەبن، خوای گەورە تەماشای جلو بەرگو لاشەتان ناکا، بەڵکو تەماشای ناو دڵتان ئەکا: ئایا چۆنە.

(بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ) مرۆڤی موسوڵمان ئەو خراپەیەی بەسە (أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ) کە بە چاوی سوکو بێنرخ تەماشای برای موسوڵمانی بکا.

(كُلُّ الْمُسْلِمِ) هەموو شتێکی موسوڵمانان (عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ) لە سەر موسوڵمان حەرامە: (دَمُهُ) خوێن ڕشتنی موسوڵمان حەرامە بە ناهەق (وَمَالُهُ) سامانی موسوڵمان حەرامە بیخۆی، یان لە ناوی بەری بە ناهەق (وَعِرْضُهُ) ئابڕوبردنو ناموس بردنی موسوڵمان حەرامە بە هەر شێوەیەك بێ کە شەرع ئیزنت نەدا (رواهُ مُسْلِم) ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدابَرُوا): دوژمنایەتیو ڕق لێهاتنو دەنگ ڕاگرتنو پشت لە یەکتری کردن لە بەر خاتری دونیا نیشانەی کەم دینیو بەدبەختییە، بەڵام لە پێناوی خواو پێغەمبەرﷺ نیشانەی ئیمانی تەواوە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَوْثَقُ عُرَى الإِيمَانِ: اَلْمُوالاَةُ فِي اللهِ وَالْمُعاداةُ فِي اللهِ وَالْحُبُّ فِي اللهِ وَالْبُغْضُ فِي اللهِ﴾ رواهُ الطبراني، توندترین دەست پێوەگرەکانی ئیمان: دۆستایەتییە لە پێناویخوا، دوژمنایەتییە لە پێناویخوا، خۆشویستنە لە پێناویخوا، ڕق لێهاتنە لە پێناویخوا.

٢- (الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ: إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللهَ

( اَلْحَديثُ السّادس والثَّلاثُون: فى الإحْسان إلَى النَّاس، وَتلاَوَة الْقُرْآن )

﴿ عَنْ أَبىِهُرَيْرَةَرَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنَ النَّبيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَة، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللهُ عَلَيْه فى الدُّنْيَا وَالآخرَة،

فَشَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ﴾ رواهُ مُسْلِم، مافى موسولْمان له سەر موسولْمان شەشە: كە دەيگەيێ سەلامى لێبكـە، هـەر كاتێـك بـۆ خـواردن بـانگى كـردى لەگـەڵى بـڕۆ، هـەر كاتێـك داواى ئامۆژگـارىى لێكـردى ئامۆژگـارىى بكـە، هـەر كاتێـك پـژمىو گـوتى: (الْحَمْدُ لله). پێى بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللهُ). هەر كاتێك نەخۆش بوو سەردانى بكـە، هـەر كاتێـك مرد لەگەڵ تەرمەكەى برۆ گۆڕستان.

٣- (بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ): **بزانـه:** ڕێزنـەگرتنى مرۆڤـى گـەورەو زاناو ماقوڵو ئايين پەروەر هەر لە خۆيدا سوكايەتىيە بـە بـراى موسـوڵمان، چـونكە ئـەم پلەيە خوا پـێى بەخشيوەو پێويستە ئێمـەش ڕێـزى لێبنـێين، پێغەمبـەر ﷺ ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّ مِنْ إِجْلاَلِ اللهِ إِكْرَامَ ذِىالشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِيفِيـهِ وَالْجَافِيعَنْـهُ، وَإِكْرَامَ ذِىالسُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ﴾ رواهُ أبوداود، بـە گـەورە ناسـينى خـوا، لەوەدايـە: كـە ڕێـز لە ڕيش سپىو پيرى موسوڵمان بندرێ، ڕێز لەو قورئانخوێنە بندرێ: كە لە سنورى قورئـان تێناپەڕێو لێيشى دوور ناكەوێ، ڕێز لە كاربەدەستى دادپەروەر بندرێ.

كەوابوو: پێويستە لە ڕۆيشتنى ڕێگەو لە دانيشتنو هەڵسان ئەم ڕێزە ڕەچاو بكرێ، چـونكە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَنْزِلُواالنَّاسَ مَنَازِلَهُمْ﴾ رواه مسلم وأبوداود، ئەم خەڵكـە بـە قـەد پلەى خۆيان ڕێزيان لێبنێن.

## ﴿ حەديسى سىو شەشەم: چاكە لەگەڵ خەڵكو، خوێندنى قورئان ﴾

(عَنْ أَبىِهُرَيْرَةَرَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنَ النَّبيِّ ﷺ قَالَ) گێڕدراوەتەوە لە (أبىهريرة): پێغەمبەر ﷺ فـەرمووى: (مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ) هەر كەسێك لاببا لە سـەر موسـوڵمانێك (كُرْبَـةً) ئـازارو تەنگانەيـەك (مِـنْ كُرَبِ الدُّنْيَا) لە ئازارو مەينەتەكانى دونيا (نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ) لە پاداشـى ئـەوە، خـواى گـەورە لـە سەر ئەوى لائەبا (كُرْبَةً) تەنگانەيەك (مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ) لـە تەنگانـەو مەينەتيـەكانى ڕۆژى دوايى، واتە: هەركەسێك موسوڵمانێك ڕزگار بكا لە تەنگانەيەكى دونيا، خواى گەورەش ئـەوى ڕزگار ئەكا لە تەنگانەى ڕۆژى دوايى.

(وَمَنْ يَسَّرَ) هەر كەسێك كارێـك ئاسـان بكـا (عَلَـى مُعْسِـرٍ) بـۆ قـەرزدارێكى دەسـت كـورتو هەژار: بەو جۆرەى قەرزەكەى بۆ بداتەوە، يان بيبورێو گەردەنى ئازاد بكا، يان ماوەكـەى بۆ دوا بخا (يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ) خواى گەورە كارو داخوازىيـەكانى بـۆ ئاسـان ئـەكا (فِـى الـدُّنْيَا وَالآخِرَةِ) لە دونياو قيامەت.

وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَاللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ تَعَالَى يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ تَعَالَى وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ وَذَكَرَهُمُ اللهُ

---

**بزانە:** باری قەرزداری زۆر بارێکی گرانە، بۆیە ئەو کەسەی باری قەرزداری لە سەر کەسێك لائەبا خوای گەورە پاداشتی لە دونیاو قیامەت ئەداتەوە، لە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ هاتوە: ﴿ئەو جۆرە کەسە دوعای قبوڵەو لە ڕۆژی دوایی لە ژێر سێبەری عەرشی خوادایە﴾.

(وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا) هەر کەسێك عەیبی موسوڵمانێك دابپۆشێ، واتە: ئەگەر گوناهێکی کرد، یان ناتەواویەکی هەبوو، یان سەرشۆڕیەکی بە سەر هات، ئەوانەی لێ ئاشکرا نەکاو بۆی دابپۆشێ، وە ئەگەر دەستکورت بوو، جلو بەرگی بۆ بکا (سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ) خوای گەورە لە پاداشتی ئەم پۆشینە، لە دونیاو قیامەت دایئەپۆشێو عەیبی ئاشکرا ناکا، جا ئەی موسوڵمان: گوناهو عەیبو ناتەواوی کەس ئاشکرا مەکە، چۆن بە خۆت شەرم ئەکەی عەیبت ئاشکرا ببێ، خەڵکیش ئەوهایە، بە تایبەتی جیران نابێ نهێنییەکانی جیران ئاشکرا بکا، هەر کەس عەیبو عاری خەڵك ئاشکرا بکا، خوای گەورە ڕیسوای ئەکا، با لە ناو ماڵی خۆیشی بێ.

(وَاللهُ فِي عَوْنِ العَبْدِ) خوای گەورە لە یارمەتی بەندەی خۆیدایە (مَا كَانَ العَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ) هەرچەندی بەندە لە یارمەتی برای خۆیدا بێ. کەواتە: ئەبێ موسوڵمان بە ئیشو کاری خەڵك خەریك بێو پێویستیەکانیان بۆ جێبەجێ بکا، چونکە بە یارمەتیدانی موسوڵمانان خوا لە تاوانەکانی خۆش ئەبێو لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری ئەکا.

(وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا) هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێتە بەر (يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا) لەو ڕێگایە مەبەستی زانستیەکی سودبەخش بێ بۆ موسوڵمانانو ڕاهی خوای مەبەست بێ (سَهَّلَ اللهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ) خوای گەورە ڕێگەیەکی بەهەشتی بۆ ئاسان ئەکا، بەڵام ئەگەر خوێندنەکەی بۆ خوا نەبێ، با چاوەڕوانی ئەو پاداشتە نەبێ لە لای خوا.

(وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ) هەر کۆمەڵێك کۆ ببێتەوە (فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ تَعَالَى) لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوا، وەك مزگەوتو قوتابخانەکانی ئایینی (يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ تَعَالَى) قورئانی پیرۆز بخوێننو (وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ) یەکتری فێرە قورئان خوێندن بکەن (إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ) ئەوانە ئارامیو دڵنیایییان بە سەردا ئەبارێو (وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ) وە ڕەحمەتو میهرەبانی دایان ئەپۆشێ، واتە: لەو کاتەدا دڵیان خۆشەو هێمنایی دێتە ناو (وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ) فریشتەی خوا دەوریان لێئەدەنو گوێیان لێڕائەگرنو ماوە نادەن شەیتان تخونیان بکەوێ (وَذَكَرَهُمُ اللهُ)

فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ﴾ رواهُ مُسْلِم بِهَذَااللَّفْظ.

خوای گەورە باسی چاکەیان ئەکا (فِيمَنْ عِنْدَهُ) لە لای ئەوانەی ڕێزو پلەی بالآیان هەیە لەلای خوا، وەکو پێغەمبەران-عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ- وە ئەنجومەنی بالآی فریشتەکان.

ماشەڵڵا! لەم باغچە خۆشەو لەو لاوە جوانانەی لە مزگەوتەکان قورئان ئەخوێننو فریشتەی خوا هاونشینیانن، خوا بۆ خاتری ئەوان ئێمەش عەفوو بکا، فەرموودەیەکی درێژی پێغەمبەرﷺ لەو بارەیەوە هەیە: کە ﴿لە کۆتاییدا خوا ئەفەرموێ: ئەی فریشتەکانی من وا من لێیان خۆش بوم. فریشتەکان ئەڵێن: خوایە، فلآنکەس هاتۆتە لایان ئیشی تایبەتی خۆی هەیەو لەو کۆمەڵە نیە؟ خوای گەورە ئەفەرموێ: بە هۆی ئەوان ئەوەی لەگەڵیشیان دانیشێ بەدبەختو بێبەش نابێ﴾. واتە: ئەویش بەختەوەرەو ڕەحمەتی خوا ئەیگرێتەوە(بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ﴾ رواهُ البخاري، واتە: باشترینتان کەسێکە خۆی فێرە قورئان بێو خەڵکیش فێر بکا.

(وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ) هەرکەسێك کارو کردەوەی خۆی دوای بخا لە کاروانی زانایانو پیاوچاکان (لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ) نەژادو بنەماڵەی خۆی بەرەو پێشی ناباو لە ڕۆژی دوایی ناگاتە پلەی خواپەرستان، ئەگەر لە دونیاش بە فرِوفێڵو خاترانەی باوكو باپیری پلەیەك وەدەست بێنێ، لە ڕۆژی دوایی لە سەر پردی جەهەننەم=(الصِّراط) لە دوایێ ئەمێنێو هاوار بۆ حاڵی. بڕوانە حەدیسی (٣٨) (رواهُ مُسْلِم) ئیمام (موسلیم) گێڕاویەتیەوە.

**پیاو ئەو پیاوەیە بە چاکە پیاو بێ**

**نەك بە هۆی باوکی ناوبانگی دیار بێ**

**ئینجا بزانە:** مرۆڤ بە هۆی زانستی ئایینی ئەچێتە ڕیزی پێغەمبەرانو شەهیدان، بەڵکو لە پلەی پێغەمبەران بەرەو خوارتر یەکسەر ڕیزی زانایانە ﴿عَنْ عُثْمانَ رضي الله عنه قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَشْفَعُ يَوْمَ الْقِيامَةِ ثَلاثَةٌ: الأَنْبِياءُ، ثُمَّ الْعُلَماءُ، ثُمَّ الشُّهَداءُ﴾ رواهُ ابن ماجە، واتە: لە ڕۆژی دوایی پێغەمبەران-عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ- شەفاعەت ئەکەن، ئینجا زانایانی ئایینی، ئینجا شەهیدانی ڕێگای خوا. خودا بە بەر شەفاعەتی ئەمانەمان بدا.

**﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾**

١- (مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا): **بزانە:** هەر کاتێك (جهاد)کردن (فَرْضُ الكفايـة) بوو، حەرامە: بە بێئیزنی دایكو باوك (جهاد) بکا، بەڵام بە سەفەرچوون بۆ فێربوونی زانستی ئایینی بە بێئیزنی دایكو باوکیش دروستە-بڕوانە (تحفة)- پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ خَرَجَ فِي طَلَبِ الْعِلْمِ فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ حَتَّى يَرْجِعَ﴾ رواهُ التّرمذی، هەر کەسێك بۆ خوێندنی ئایینی لە ماڵەوە دەربچێ: ئەوە لە (جهاد)ی ڕێگای خوادایە تا ئەگەڕێتەوە.

## ( اَلْحَديثُ السّابع والثّلاثُون: اَلْحَسنَةُ بعَشْرِ أَمْثالها إلَى سَبْعمأَة ضعْف )

﴿ عَنْ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنهُما: عَنْ رَسُول اللهِ ﷺ فيمَا يَرْويه عَنْ رَبِّه تَبارَكَ وَتَعالَى، قَالَ ﷺ: إنَّ اللهَ كَتَبَ الْحَسنَات وَالسَّيِّئَات ثُمَّ بَيَّنَ ذلكَ: فَمَنْ هَمَّ بحَسَنَة فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ تَعالَى عنْدَهُ حَسَنَةً كَاملَةً،

---

٢- (فِي بَيْت مِنْ بُيُوت اللهِ تَعالَى): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿إنّ هَذه الْمَساجدَ لاَ تَصْلُحُ لشَيْءٍ منْ هَذَا الْبَوْلِ وَلاَ الْقَذَرِ إنّما هيَ لذكْرِ اللهِ تَعالَى وَقراءَة الْقُرْآن﴾ رواهُ مُسْلم، ئەم مزگەوتانە، ناگونجێن بۆ میز لێکردنو چڵکنی، بەڵکو مزگەوت بۆ نوێژو زیکری خواو خوێندنی قورئان داندراوە، شاعیرێکی موسوڵمان ئەڵێ:

قورئان بەرنامەی ژینمانە    ئیسلام ڕێبازی دینمانە

ئەوەی مزگەوت پێی بگەێنێ    خاكو میللەت نادۆڕێنێ

ئەوەی دوورە لە ماڵی خوا    نازانێ چۆن بژیێو بڕوا

٣- (يَتْلُونَ كتَابَ اللهِ تَعالَى): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿فَلأَنْ يَغْدُوَ أَحَدُكُمْ إلَى الْمَسْجد فَيَتَعَلَّمَ آيَتيْنِ منْ كتَاب اللهِ تَعالَى خَيْرٌ لَهُ منْ نَاقَتَيْنِ﴾ رواهُ مُسْلم، کە یەکێکتان هەموو ڕۆژێك بڕواتە مزگەوت، دوو ئایەتی قورئان فێر ببێ، خێری زۆرترە لە وەدەستهێنانی دوو ووشتر.

٤- (لَمْ يُسْرِعْ به نَسَبُهُ): پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿يَا مَعْشَرَ بَنيعَبْدالْمُطَّلب أَنْقذُوا أَنْفُسَكُمْ يَا فَاطمَةُ بنْتَ مُحَمَّد أَنْقذى نَفْسَك منَ النَّار فَإنِّي لاَ أَمْلكُ لَك ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا، إنَّ لَك رَحمًا سَأَبُلُّهَا ببلاَلهَا﴾ رواهُ التّرمذی، ئەی نەتەوەی پشتی (عبدالمطلب)ی باپیرم، خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگری دۆزەخ بە کردەوەی چاکە، چونکە لە ڕۆژی دوایی زیانو سودی ئێوە لە دەستەڵاتی مندا نیە، ئەی (فاطمة)ی کیژم خۆت ڕزگار بکە لە ئاگری دۆزەخ بە کردەوەی چاکە، چونکە زیانو سودی تۆ لە دەستەڵاتی مندا نیە، لەگەڵ من ڕەحمێکت هەیە، مافی ئەم ڕەحمەت لە دونیادا ئەدەمێ.

## ﴿ حەدیسی سیو حەفتەم: چاکە یەك بە دە -تا- حەفت سەدە ﴾

(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا: عَنْ رَسُولِ اللهِ) ﷺ (ئیبن عەبباس) خوا لێیان ڕازی بێ لە پێغەمبەر ﷺ ئەگێڕێتەوە (فيمَا يَرْويه عَنْ رَبِّه تَبارَكَ وَتَعالَى) لەو حەدیسە قودسیانەی پێغەمبەر ﷺ لە خوای گەورە دەگێڕێتەوە (قَالَ: إنَّ اللهَ كَتَبَ الْحَسنَات) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە فەرمانی داوەتە فریشتەکان بە نووسینی چاکەکانو (وَالسَّيِّئَات) خراپەکان (ثُمَّ بَيَّنَ ذَلكَ) ئینجا خوای گەورە بۆی ڕوون کردونەوە چۆن بینوسن:

(فَمَنْ هَمَّ بحَسَنَة) ئەگەر کەسێك ویستی چاکەیەك بکا (فَلَمْ يَعْمَلْهَا) ئینجا بۆی ڕێك نەکەوت بیکا (كَتَبَهَا اللهُ تَعالَى عنْدَهُ) خوای گەورە ئەو ویستنەی لە لای خۆی بۆی ئەنووسێ (حَسَنَةً كَاملَةً) بە چاکەیەکی تەواو، چونکە نیازێکی باشی هەبووە.

وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللهُ تَعالَى عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِمِأَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَإِنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ تَعالَى عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً ﴾ رواهُ البخاري وَمُسْلِم.

---

(وَإِنْ هَمَّ بِهَا) هەروەها ئەگەر ویستی چاکەیەك بکا (فَعَمِلَهَا) چاکەکەشی کرد (كَتَبَهَا اللهُ تَعالَى عِنْدَهُ) خوای گەورە ئەو چاکەیەی لە لای خۆی بۆ ئەنووسێ (عَشْرَ حَسَنَاتٍ) بە دە چاکە، چونکە خێری چاکە: یەك بە دەیە، بەڵام جاری وا هەیە ئەگەر خوای گەورە حەز بکا خێری چاکە لەم دەیە بۆ هەندێ کەس زۆرتر ئەکا (إِلَى سَبْعِمِأَةِ ضِعْفٍ) تا ئەگاتە حەفت سەد چاکەو (إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ) هەتا خوا بە خۆی حەز ئەکا هەر چاکەی زۆرتر بۆ ئەنووسێ.

بۆ وێنە: یەك دەنکە گەنم لە زەویی‌یەکی باشدا بچێنە، وا دەبێ لەم دەنکە حەفت گوڵی لێدەردەچێ، هەر گوڵەش سەد دانەی تێدایە، ئەبێ بە حەفت سەد، خۆ ئەگەر ئەم بەرهەمە جارێکی‌تر بچێنیەوە، هەر خوا ئەزانێ چەند زۆر ئەبێ، چاکەش ئەوهایە.

(وَإِنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ) ئەگەر کەسێك ویستی خراپەیەك بکا (فَلَمْ يَعْمَلْهَا) بەڵام لە ترسی خوا نەیکرد (كَتَبَهَا اللهُ تَعالَى عِنْدَهُ) خوای گەورە ئەم نەکردنەی لە لای خۆی بۆ ئەنووسێ (حَسَنَةً كَامِلَةً) بە چاکەیەکی تەواو، چونکە لە ترسی خوا نیازی خۆی پاك کردۆتەوە، بەڵام ئەگەر لە ترسی خوا وازی لێنەهێنا، بەڵکو دەستەڵاتی نەبو بیکا، یان بۆی ڕێك نەکەوت، ئەوە چاکەی بۆ نانووسرێ، بەڵکو تەنها خراپەکەی لە سەر نانووسرێ.

(وَإِنْ هَمَّ بِهَا) وە ئەگەر ویستی خراپەکە بکاو (فَعَمِلَهَا) خراپەکەشی کرد (كَتَبَهَا اللهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً) خوای گەورە تەنها یەك خراپەی لە سەر ئەنووسێو سزای یەك خراپەی لێوەرئەگیرێ، ئەمەش لە گەورەیی خوایە، چونکە زۆر جاری وا هەیە: مرۆڤ بیر لە خراپە کردن ئەکاتەوەو ئەیەوێ خراپەیەك بکا، بەڵام هەتا بە دەست، یان بە زوبان خراپەکە نەکا، لە سەری نانووسرێ (رواهُ البخاري وَمُسْلِم) ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم) گێڕاویەتیانەوە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (كَتَبَهَا اللهُ تَعالَى عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِذَا أَحْسَنَ أَحَدُكُمْ إِسْلَامَهُ فَكُلُّ حَسَنَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِأَةِ ضِعْفٍ، وَكُلُّ سَيِّئَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَهُ بِمِثْلِهَا، إِلاَّ أَنْ يَتَجَاوَزَ اللهُ عَنْهَا﴾ رواهُ الشَّيْخان، هەر کاتێك یەکێکتان بووە موسوڵمانێکی بێگەرد، هەر چاکەیەکی ئەیکا بە دە چاکەی بۆ ئەنووسرێ تا حەفت سەد، وە هەر خراپەیەکی ئەیکا، هەر بە یەك خراپەی بۆ ئەنووسرێ، مەگەر خوا چاوپۆشی‌ی لێبکا.

٢- (وَإِنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا): **بزانە :** هەر کەسێك بە سەر دڵی‌دا بێ خراپەیەك بکا، ئەوە لە سەری نانووسرێ تا ئەیکا، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ

( اَلْحَديثُ الثّامن والثَّلاثُون: في مُوالاة الله تَعالَى )

﴿ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ تَعالَى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُهُ عَلَيْهِ،

---

أَنْفُسُهَا مَا لَمْ يَتَكَلَّمُوا أَوْ يَعْمَلُوا بِهِ﴾ رواهُ مُسْلِم، خوای گەورە چاوپۆشی ی لە ئوممەتی من کردوە لەو خراپانەی بە سەر دڵیاندا دێ، بەو مەرجەی نەیکەن‌و بە زوبانیش نەیڵێن.

بەڵام ئەگەر ویستی خراپەیەك بکاو دەستی پێ‌کردو سوور بوو لە سەر کردنی‌و بۆی نەگونجا بیکا، ئەوە تاوانی ئەو نیازە خراپەی بۆ ئەنووسرێ هەروەك پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ! قِيلَ: فَهَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ ﷺ: إِنَّهُ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ﴾ رواهُ الشَّيْخان، هەر کاتێك دوو موسوڵمان ڕووبەڕووی یەکتر بون‌و یەکێکیان ئەوی‌تری کوشت، هەردووکیان ئەچنە ئاگری دۆزەخ! گوترا: باشە، ئەمەیان مرۆڤکوژەکەیە تاوانی دیارە، بەڵام کوژراوەکە بۆچی ئەڕواتە دۆزەخ؟ فەرمووی: چونکە ئەویش ویستی ئەوی‌تر بکوژێ‌و سوور بوو لە سەر تاوانەکە.

## ﴿ حەدیسی سی‌و هەشتەم: دۆستایەتی خوای گەورە ﴾

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ) ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ: (قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ) پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسێکی قودسی‌دا ئەفەرموێ: (إِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ) خوای گەورە هەڕەشە ئەکاو ئەفەرموێ: (مَنْ عَادَى) هەر کەسێك دوژمنایەتی بکا (لِي وَلِيًّا) لەگەڵ دۆستێکی من (فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ) ئاگاداری ئەکەمەوە: کە من بە خۆم جەنگی لەگەڵ ئەکەم لەجیاتی دۆستەکەی خۆم، چونکە دوژمنایەتی لەگەڵ مندا ئەکا، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ خوای گەورە بەرگری لەو کەسانە ئەکا: کە ئیمانیان هێناوە. کەوابوو: گشت ئیمانداریکی ڕاستەقینە دۆستی خوایەو بە ناهەق دژایەتییان مەکە، چونکە خوای گەورە ماڵوێرانت ئەکا.

**بزانە:** دۆستی خوا کەسێکە زۆر خواپەرست بێ‌و غەمخۆری ئیسلام بێ‌و ماڵخۆری خەڵك نەبێ‌و زۆریش لە خوا بترسێ‌و خواناس بێ.

دیسان **بزانە:** ڕیبا خۆر و ڕێگر، هەردووکیان بەو جۆرە دوژمنەی خوا داندراون: کە خوا بەخۆی جەنگیان لەگەڵ ئەکا، چونکە زیانیان زۆرە بۆ باری ئابووری‌و خوێنی خەڵك.

(وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي) بەندەی من ناتوانێ خۆی لە من نزیك بکاتەوە (بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ) بە هیچ کردەوەیەکی وا: کە من لە لام خۆشەویستتر بێ (مِمَّا افْتَرَضْتُهُ عَلَيْهِ) وەك بەو شتانە نزیك ئەبێتەوە کە لە سەرم واجب کردوە، واتە: بەجێ‌هێنانی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر ﷺ ئەبنە هۆی نزیکبوونەوە لە خوای گەورە زیاتر لە هەموو کردەوەیەکی‌تر، چونکە خێری واجب حەفتا پلەی زۆرترە لە سوننەت.

وَلاَ يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطُشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي لأُعْطِيَنَّهُ وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ ﴾ رواهُ البخاري.

---

(وَلاَ يَزَالُ عَبْدِي) بەندەی من بەردەوام ئەبێو واز ناهێنێ (يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ) بەرە بەرە خۆی لە من نزیك ئەكاتەوە (بِالنَّوَافِلِ) بە كردنی سوننەتەكان، پاش ئەوەی واجبەكان بكا؟ چونكە ئەگەر واجبەكان نەكا سودی نیە (حَتَّى أُحِبَّهُ) هێندە سوننەت ئەكا هەتا خۆشم ئەوێ.

**پێناسە:** سوننەت ئەوەیە: بە كردنی پاداشتت بدرێتێو بە وازهێنانی سزا نەدرێی.

**بزانە:** لە هەموو سوننەتەكان گەورەتر نوێژی سوننەتە، بە تایبەتی شەونوێژ، لە هەموو زیكرێكیش گەورەتر قورئان خوێندنە، چونكە زووتر لە خوای گەورەت نزیك ئەكاتەوە، كەوابوو: ئەی موسوڵمان: پاش ئەوەی واجبەكانت هەموو كردن، بە گوێرەی توانا نوێژی سوننەتو ڕۆژوو خێركردنو قورئانخوێندنو زیكری خوا بكە، بەمە لە لای خوا خۆشەویست ئەبی.

(فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ) جا هەر كاتێك بەندەی خۆمم خۆشویست (كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ) بۆی ئەبمە ئەو گوێیەی كە پێی ئەبیسێ، واتە: هەرچی بۆ ڕەزای من نەبێ، گوێی لێناگرێ، ئەوەی بۆ ڕەزای من بێ گوێی ئەداتێ (وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ) بۆی ئەبمە ئەو چاوەی كە پێی تەماشا ئەكا، واتە: ئەوەی من پێی ڕازی نەبم تەماشای ناكا (وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطُشُ بِهَا) بۆی ئەبمە ئەو دەستەی هەڵمەتی پێ ئەبا، واتە: دەست درێژ ناكا بۆ شتێ كە من پێی ڕازی نەبم، بە كاری ئەهێنێ لە چاكە كردن (وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا) بۆی ئەبمە ئەو قاچەی كە پێی ئەڕوا، واتە: هاتوچوونەكەی بۆ ڕازیبوونی خوا ئەبێ.

ئینجا كە مرۆڤ واجبەكانی بە پوختی كردنو زیاد لەمەش سوننەتی كردنو دیتنو بیستنو ڕۆیشتنو دەست بۆ بردنی هەر بۆ خوا بوو، خوای گەورەش بێ دڵی ناكا، بۆیێ ئەفەرموێ: (وَإِنْ سَأَلَنِي) هەر شتێكم داوا لێبكا (لأُعْطِيَنَّهُ) بێگومان پێی ئەبەخشم (وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي) ئەگەر داوای پەنادانم لێبكا (لأُعِيذَنَّهُ) بێگومان پەنای ئەدەمو ئەیپارێزم (رواهُ البخاري) ئیمامی (بوخاری) گێڕاویەتیەوە.

**ئاگاداری:** لەو حەدیسە پیرۆزە بۆمان دەركەوت هیچ كەسێك بە بنەچەكەو بنەماڵە نابێتە دۆستی خوا، هەروەها بە جلی شڕو چڵكاویو خۆ گێلكردن نابێتە دۆستی خوا، پێغەمبەرﷺ (١١٤٠٠) سەدوچواردە هەزار سەحابەی هەبون، هەموویان دۆستی خوا بون چونكە خواپەرستو تێكۆشەرو چالاك بونو لە ڕێگای خوا جیهادیان ئەكردو گیانو ماڵی خۆیان فرۆشتە خوای گەورەو دۆستایەتی دوژمنانی خوایان نەئەكردو كچو ژنی ڕووتیان لە ماڵەوە نەبو، كەوابوو: دۆستی خوا بەم تەرازووە تاقی بكەوە.

( اَلْحَديثُ التّاسِع والثّلاثُون: رَفْعُ الْحَرَجِ عَنْ بَعْضِ النّاسِ )

﴿ عَنْ ابنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إنَّ اللهَ تَجَاوَزَ لي عَنْ أُمَّتي اَلْخَطَأَ،

---

**ئینجا بزانە:** ئەتوانین ئەم حەدیسە لەم ئایەتە پیرۆزەدا کۆ بکەینەوە ﴿قُلْ إنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ بەم خەڵکە بڵێ: ئەگەر بە ڕاستی ئێوە خواتان خۆش ئەوێ، شوێن بەرنامەی من بکەون، تاکو خوا خۆشی بوێنو لە گوناهتان خۆش ببێ. کەواتە: هەرکەسێك بە یاسای ئیسلام ڕەفتار نەکا، ئەوە ئاشکرایە کە خواو پێغەمبەریﷺ خۆش ناوێو ماڵوێرانە.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا): ئەتوانین بڵێین: دۆستی خوا لەم ئایەتەدا باسیان کراوە، کە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا﴾ واتە: هەر کەسانێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرﷺ بن، ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانە حەشریان ئەکرێ: کە خوای گەورە نیعمەتی بە سەردا باراندون: کە پێغەمبەرانو یارە ڕاستگۆیەکانی پێغەمبەرانو شەهیدانو پیاوچاکانن، ئای ئەمانە چەند هاوڕێی باشو بەڕێزی بەهەشتن!.

٢- (وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدي بشَيْءٍ أَحَبَّ إلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُهُ عَلَيْهِ): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَعْذَرَ اللهُ إلَى امْرِئٍ أَخَّرَ أَجَلَهُ حَتَّى بَلَّغَهُ سِتِّينَ سَنَةً﴾ رواهُ البخاري، خوای گەورە هیچ بەهانەی نەهێشتۆتەوە بۆ مرۆڤێك، کە نەیمراندبێ تا تەمەنی گەیشتۆتە شەست ساڵ. واتە: هیچ بیانوی بە دەستەوە نیە کە لەو ماوە درێژەدا خۆی لە خوا نزیك نەکردبێتەوە: بە ئەنجامدانی ئەو واجبانەی خوا فەرمانی پێکردوە.

٣- (يَتَقَرَّبُ إلَيَّ بالنَّوَافِلِ): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿اَلْكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ، وَالْعَاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا وَتَمَنَّى عَلَى اللهِ الأمَانيَّ﴾ رواهُ التّرمذي، مرۆڤی ژیرو عاقڵ ئەو کەسەیە: بە خۆی دابێتەوەو لێپێچانەوە لەگەڵ خۆیدا بکاو کردەوەی باش بکا بۆ دوای مردن، مرۆڤی تەمبەڵو گێل ئەو کەسەیە: بە دوای هەواو هەوەسی خۆی بکەوێو خۆزگە لە خوا بخوازێو بڵێ: دەی دەی خوا عەفووم ئەکا.

## ﴿ حەدیسی سیو نۆیەم: لابردنی گوناهی چەند کەسێك ﴾

(عَنْ ابنِ عَبَّاسٍ)رَضِيَ اللهُ عَنْهُما (ئیبن عەبباس) خوا لێیان ڕازی بێ، ئەفەرموێ: (أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إنَّ اللهَ تَجَاوَزَ) خوای گەورە لایبردوە (لي) لە بەر خاتری من (عَنْ أُمَّتي) لە سەر ئوممەتی من (اَلْخَطَأَ) سزای گوناهێك: کە بە هەڵە بکرێ، واتە: لە ڕۆژی دوایی لە سەر ئەو گوناهە بە هەڵەیە گوناهبارەکە سزا نادا.

وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ﴾ حَدِيثٌ حَسَنٌ، رواهُ ابنُ ماجه وَالْبَيْهَقِي وَغَيْرُهُما.

**ئاگاداری:** ئەگەر ئەو گوناهە بە هەڵەیە، پەیوەندی بە ماڵ، یان بە خوێن هەبوو: وەکو کوشتنی کەسێك، یان بریندارکردنی، یان خواردنو لەناوبردنی ماڵی کەسێك، یان ماڵێکی گشتی، ئەمانە هەموویان لە دونیا تۆڵەیان هەیە.

(وَالنِّسْيَانَ) هەروەها خوای گەورە لایبردوە لە سەر ئۆممەتی من سزای گوناهێك: کە لە بیری چوبێتەوە، لە ڕۆژی دوایی لە سەر ئەو گوناهە گوناهبارەکە سزا نادا، وەك کەسێك سوێند بخوا: کە ئەو ئیشە ناکا. بەڵام سوێندەکەی لە بیر چۆوەو ئیشەکەی کرد، ئەوە گوناهی ناگاتیو سوێندی لێناکەوێو بۆ جارێکیتر سوێندەکە هەر ئەمێنێ.

**ئاگاداری:** ئەم گوناهەش ئەگەر پەیوەندی بە خوێنو ماڵ هەبێ: تۆڵەی دونیای لە سەر لاناچێ، هەروەها ئەگەر بە هۆی کەمتەرخەمیش لە بیری چوبێ، لە سەری لاناچێ: وەك کەسێك جلی پیس بێو نەیشوا، یان نەیگۆڕێ، ئینجا لە بیری چوو بەو جلەوە نوێژی کرد، ئەبێ دووبارەی بکاتەوە.

(وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ) هەروەها لایبردوە سزای گوناهێك کە بە زۆر پێیان کردبێ، بە مەرجێ زۆردارەکە توانای هەبێ: یان بیکوژێ، یان لێیبدا، یان بیخاتە بەندیخانە، یان ماڵی لێبستێنێ، لەو جۆرە کەسانەش بێ هەڕەشەکە بگەیەنێتە جێ (حَدِيثٌ حَسَنٌ، رواهُ ابنُ ماجه وَالبَيْهَقِي وَغَيْرُهُما) ئیمام (ئیبن ماجە)و (بەیهەقی)و کەسانیتر گێڕاویەتیانەوە.

**ئاگاداری:** کوشتنی بە ناهەق: بە زۆرلێکردنیش دروست نیەو لە دونیاو قیامەت سزای هەیە، هەروەها زیناش دروست نیەو لە قیامەت سزای هەیە، بەڵام ئەگەر بۆ خواردنو لەناوبردنی ماڵی کەسێکیتر، یان ماڵێکی گشتی زۆری لێکرا: با بیکاو تۆڵەی دونیاو قیامەت لە سەر زۆردارەکەیە.

**ئینجا بزانە:** خوای گەورە لە بەر خاتری پێغەمبەرﷺ چەند سەربەرزیەکیتریشی بە موسوڵمانان بەخشیوە، کە لە چەند حەدیسی جۆراوجۆردا باسیان کراوە:

بۆ نموونە: ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: عَنِ النَّبِيِّﷺ قَالَ: إِنَّ اللهَ لاَ يَجْمَعُ أُمَّتِي عَلَى ضَلاَلَةٍ، وَيَدُ اللهِ مَعَ الْجَمَاعَةِ وَمَنْ شَذَّ شَذَّ إِلَى النَّارِ﴾ رواهُ التّرمذي وقال غريب، وقال الأحوذي: لَهُ شـواهد. خوای گەورە ئۆممەتی من لە سەر گومڕایی کۆ ناکاتەوە، دەستی یارمەتی خوا لەگەڵ کۆمەڵدایە، هەر کەسێك لە کۆمەڵی موسوڵمانان دەرچێ بەرەو دۆزەخ ئەڕوا.

**ئینجا بزانە:** ئەم حەدیسە بەلگەیە: کە (إِجْمَاع) واتە: یەکدەنگی زانایانیئیسلام بەلگەیسێیەمە لە دوای قورئانو حەدیس.

## ( اَلْحَدِيثُ الأَرْبَعُون: اَلإِسْتِعْدَادُ لِلْمَوت )

﴿عَنْ ابنِ عُمَر رضي الله عنهما قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللهِﷺ بِمَنْكِبِي، فَقَالَ: (كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ)،

---

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (إِنَّ اللهَ تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي): ووشەی (لِي) وا ئەگەیەنێ: کە پێغەمبەرﷺ لە لای خوای گەورە زۆر بەڕێزە، خوای گەورە لە بەر خاتری ئەوی ئەم ئۆممەتەی کردۆتە باشترین ئۆممەت، ئینجا جگە لە لێبوردنی ئەم سێ تاوانە: خوای گەورە چەند ڕێزێکی‌تریشی لە ئێمە ناوە، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِأَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا﴾ رواهُ أبوداود، خوای گەورە لە سەری هەموو سەد ساڵێکدا یەکێك بۆ ئۆممەتم تەرخان ئەکا، تاکو ئایینەکەی بۆ نوێ بکاتەوە.

٢- (وَالنِّسْيَانَ): هەر کەسێك بە هۆی کەمتەرخەمی شتێك لە بیر خۆی بباتەوە، ئەوە تاوانی لە سەر ئەنووسرێ، هەروەکو پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَا مِن امْرِئٍ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ ثُمَّ يَنْسَاهُ إِلاَّ لَقِيَ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَجْـذَمَ﴾ رواهُ أبوداود، هەر مرۆڤێك قورئان بخوێنێ، ئینجا لە بیری خۆی بباتەوە، لە ڕۆژی دوایی بە گروویی دێتە دادگای خوا.

٣- (اَلْخَطَأَ...وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ): هەر تاوانێك پەیوەندی بە ئادەمیزادەوە هەبێ، تۆڵەی لە سەرە، هەرچەند بە هەڵە، یان بە زۆرلێکراویش بیکا، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ﴾، هەر کەسێك موسوڵمانێك بە هەڵە بکوژێ، ئەبێ کۆیلەیەکی موسوڵمان لە (كَفّارة) ئازاد بکاو خوێنی کوژراوەکەش بداتە میراتگرەکانی کوژراوەکە.

## ﴿ حەدیسی چلەم: خۆ ئامادەکردن بۆ مردن ﴾

(عَنْ ابنِ عُمَر رضي الله عنهما قَالَ) ئیبن عومەر ئەفەرموێ: (أَخَذَ رَسُولُ اللهِﷺ بِمَنْكِبِي) پێغەمبەرﷺ شانی منی گرتو (فَقَالَ) فەرمووی: (كُنْ فِي الدُّنْيَا) خۆت وا لێبکە لەم دونیایەدا (كَأَنَّكَ غَرِيبٌ) وەك خەڵکی ئەم دونیایە نەبی‌و بێگانە بی (أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ) یان وەك ڕێبوارێك بی بەم دونیایەدا تێبپەڕی بۆ گۆڕستان.

واتە: کەسێك بێگانە بوو لە شوێنێك-چونکە بە تەمای لاچوونە- خۆی خەریك ناکا بە ماڵ دانان، ململانێ لەگەڵ کەس ناکا، هەروەها ڕێبوار هەموو هەوڵی بۆ ئەوەیە زووتر بگاتە شوێنەکەی خۆی‌و لەگەڵ ماڵو منداڵی خۆی دانیشێ‌و پشوو بدا، کەوابوو: لە ڕێگەدا خۆی بە هیچ خەریك ناکا، جا مرۆڤی موسوڵمان ئەبێ ئەوها بێ، ئەم دونیایە بە وڵاتی‌خۆی دانەنێ، بەڵکو وڵاتی بە ڕاستی بەهەشتی خوایەو ئەبێ هەوڵ بۆ قیامەت

وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما يَقُولُ: إِذَا أَمْسَيْتَ فَلاَ تَنْتَظِرِ الصَّبَاحَ وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلاَ تَنْتَظِرِ الْمَسَاءَ، وَخُذْ مِنْ صِحَّتِكَ لِمَرَضِكَ وَمِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ﴾ رواهُ البخاري.

---

بدا، جگە لە جلو بەرگو خواردنی خۆیو ماڵو منداڵی لەگەڵ خانوویێکی بە کەڵك دانیشتن بێ، خۆی بە هیچیتر لەم دونیایە خەریك ناکا.

(وكَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما يَقُولُ) ئیبن عومەر بە واتەی ئەم حەدیسە ئەیفەرموو: (إِذَا أَمْسَيْتَ) هەر کاتێك گەیشتیە ئێوارە (فَلاَ تَنْتَظِرِ الصَّبَاحَ) چاوەڕوانی ئەوە مەکە بگەیتە بەیانی (وَإِذَا أَصْبَحْتَ) هەروەها: ئەگەر گەیشتیە بەیانی (فَلاَ تَنْتَظِرِ الْمَسَاءَ) چاوەڕوانی ئەوە مەکە بگەیتەوە ئێوارە. واتە: با مردن لە بەرچاوت بێ لە هەموو کاتێکدا.

(وَخُذْ مِنْ صِحَّتِكَ) لە کاتی لەش ساغی کردەوەی زۆر بکە (لِمَرَضِكَ) بۆ ئەوەی بەشی کاتی نەخۆشیت بکا، چونکە لە نەخۆشیدا خواپەرستیت بە تەواوی بۆ ناکرێ (وَمِنْ حَيَاتِكَ) هەروەها هەتا زیندووی زۆر خوا بپەرستە (لِمَوْتِكَ) تا دوای مردن سودی لێوەربگری (رواهُ البخاري) ئیمامی (بوخاری) گێڕاویەتیەوە.

**بزانە:** لە فەرموودەیەکیتردا هاتوە: پێنج شت بە دەستکەوتووی خۆت بزانە پێشی پێنج شت: گەنجیت پێشی پیربوونت، ساغیت پێشی نەخۆشیت، هەبوونیت پێشی هەژاربوونت، بێئیشیت پێشی پڕئیشیت، ژیانت پێشی مردنت.

**ئینجا بزانە:** بە خۆ ئامادەکردن بۆ مردنو بایەخ پێنەدانی دونیا، مرۆڤ ئەبێتە خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ، چونکە ژیانی پێغەمبەرﷺ بەم شێوەیە بووە ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مُغَفَّلٍ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ وَاللهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ. فَقَالَ ﷺ: أُنْظُرْ مَاذَا تَقُولُ؟ فَقَالَ: وَاللهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ ﷺ: إِنْ كُنْتَ تُحِبُّنِي فَأَعِدَّ لِلْفَقْرِ تِجْفَافًا، فَإِنَّ الْفَقْرَ أَسْرَعُ إِلَى مَنْ يُحِبُّنِي مِنَ السَّيْلِ إِلَى مُنْتَهَاهُ﴾ رواهُ التِّرمذي، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، والله خۆشم ئەوێی. تا سێ جار، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر ڕاست ئەکەی، خۆت بۆ هەژاری ئامادە بکە، چونکە هەژاری زووتر ئەگاتە خۆشەویستانی من لە لافاو کە هەڵئەستێو ئەگاتە شوێنی خۆی.

### ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَتِ الآخِرَةُ هَمَّهُ جَعَلَ اللهُ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ وَجَمَعَ لَهُ شَمْلَهُ وَأَتَتْهُ الدُّنْيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ، وَمَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ جَعَلَ اللهُ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ وَفَرَّقَ عَلَيْهِ شَمْلَهُ وَلَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ مَا قُدِّرَ لَهُ﴾ رواهُ التِّرمذي، هەر کەسێك هەموو هەوڵێکی بۆ قیامەت بێ، خوای گەورە دەوڵەمەندیی ئەخاتە ناو دڵیو هەموو کارێکی بۆ کۆ ئەکاتەوەو بۆی ڕێك دێخێ، ڕزقیشی بۆ دێ بێئەوەی هەوڵی بۆ بدا، بەڵام هەر کەسێك هەموو

## (اَلْحَدِيثُ الْحادى والأَرْبَعُون: فِي اتِّباعِ ما جاءَ به النَّبيُّ ﷺ)

﴿عَنْ أَبِي مُحَمَّد عَبْدِاللهِ بن عمْرو بن الْعاص رضي الله عنهما قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ ﷺ: لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُم حَتَّى يَكُونَ هَوَاهُ تَبعاً لما جِئْتُ به﴾

---

هەوڵی بۆ دونیا بێ، خوای گەورە هەژاریی ئەخاتە نێو چاوانیو کارەکانی لێپەرتەوازە ئەکاو بۆی ڕێك ناکەون، جگە لە بەشی خۆی ڕزقی زیادی بۆ نایێ.

٢- (وَمنْ حَيَاتِكَ لمَوْتكَ): پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إنَّ ممَّا يَلْحَقُ الْمُـؤْمنَ مِـنْ عَمَلِـه وَحَسَنَاته بَعْدَ مَوْته: علْمًا عَلَّمَهُ وَنَشرَهُ، وَوَلَدًا صَالحًا تَرَكَهُ، وَمُصْحَفًا وَرَّثَهُ، أَوْ مَسْجدًا بَنَاهُ، أَوْ بَيْتًا لابْنِ السَّبِيلِ بَنَاهُ، أَوْ نَهْرًا أَجْرَاهُ، أَوْ صَدَقَةً أَخْرَجَهَا مِنْ مَالِه فِي صِحَّتِه وَحَيَاتِه يَلْحَقُهُ مِنْ بَعْـدِ مَوْتِـه﴾ رواهُ إبن ماجه، هەندێك لەو كردەوە چاكانەی ئەگەنە موسوڵمان لە دوای مردنی: زانستێكی ئایینییە كە فێری خەڵكی كردبێ، یان بڵاوی كردبێتەوە، منداڵێكی باشە كە لە پاش مردنی دوعای بۆ بكا، قورئانێكە بە میرات بەجێی هێشتبێ، یان مزگەوتێكی دروست كردبێ، یان خانوویەكی بۆ ڕێبواران دروست كردبێ، یان ڕوبارێكو ئاوێك بۆ خواردنەوەو دەستنوێژ ڕێكی خستبێ، یان خێرێكی بە دەستی خۆی كردبێ لە كاتی لەش ساغیو ژیانیدا ئەویش لە دوای مردن ئەیگاتێ.

### ﴿حەدیسی چلو یەكەم: شوێنكەوتنی ئەوەی پێغەمبەرﷺ هێناویەتی﴾

(عَنْ أَبِي مُحَمَّدٍ عَبْدِاللهِ بنِ عمْرو بنِ العَاصِ) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا (عبدالله)ی كوڕی (عەمر)ی كوڕی (عاس) خۆیو باوكی سەحابەنە، یەكێكە لە چوار (عبدالله)یەكان، لە (مەككە)ی پیرۆز لە دایك بووە، بە (١١) ساڵ لە باوكی خۆی بچووكترە (٧٠٠) حەدیسی گێڕاونەوە، لە ساڵی (٦٥)ی كۆچی لە (مەككە)ی پیرۆز وەفاتی كرد، تەمەنی (٧٢) ساڵ بوو.

(قَالَ) ئەفەرموێ: (قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُم) ئیمان= بیروباوەڕی كەستان تەواو نابێ بە خواو پێغەمبەرو ڕۆژی دوایی (حَتَّى يَكُونَ هَواهُ) تا وای لێدێ: ئارەزوو هەوەسی خۆی (تَبعاً لِما جِئْتُ بِهِ) دوای ئەو شەریعەتە ئەكەوێ: كە من لە لای خوا هێناومە.

واتە: ئەو كەسە موسوڵمانەو ئیمانی تەواوە، كە بە حوكمی خواو پێغەمبەرﷺ ڕازی بێ، ئەگەر بە هیچ جۆرێك بە حوكمی خواو پێغەمبەرﷺ ڕازی نەبو، ئەوە كافرە، جا ئەگەر باوەڕی پێهەبوو، بەڵام ئیشی بە قورئان نەئەكرد، ئەوە فاسقە، واتە: موسوڵمانێكی ناتەواوە، باوەڕیشی ناتەواوە، بەو مەرجەی ووشەی كوفری بە سەر زوبانەدا نەهاتبێ، ئەگینا: ئەمەش هەر كافرە.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لەم بابەتە ئەفەرموێ: ﴿فَلاَ وَرَبِّـكَ لاَ يُؤْمِنُـونَ﴾ سوێند بە خوای تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ بیروباوەڕی هیچیان تەواو نیە ﴿حَتَّى يُحَكِّمُـوكَ﴾ تا ئەتۆ

حَدِيثٌ صَحِيح رَوَيْنَاهُ فِي كِتَابِ الْحُجَّة بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ.

ئەکەن بە حاکم ﴿فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ لەو کێشەی لە نێوانیاندا ڕوو ئەدا ﴿ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ﴾ نەك هەر بە ئاشکرایی بە حوکمی تۆ ڕازی بنو بەس، بەڵکو ئەبێ بە دڵیش ڕازی بنو هیچ گرێیەك لە ناو دڵیاندا نەبێ بە هۆی ئەو حوکمەی تۆ کردوتە ﴿وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ ئەبێ بە تەواوی خۆیان بدەنە دەست حوکمی خواو پێغەمبەرﷺ، ئینجا بە ئیماندارو موسوڵمانی تەواو دائەندرێن.

(حَدِيثٌ صَحِيح، رَوَيْنَاهُ فِي كِتَابِ الْحُجَّة بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ) حەدیسێکی ڕاستە، گێڕامانەوە لە کتێبی (الْحُجَّة) کە داندراوی (نَصر بن إبراهيم المقدسي)یە، بەڵام لە زنجیرەی پیاوەکانی ئەم حەدیسەدا دوو کەسیان تێدایە، زۆر کەس لێیان ناڕازیەو ئەڵێن: حەدیسەکە لاوازە. زۆر کەسیش لێیان ڕازیەو ئەڵێن: حەدیسەکە ڕاستەو بەهێزە. ئیمامی (النواوي) یەکێکە لەمانە، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، ئایەتەکەش بەهێزیی حەدیسەکە بەهێزتر ئەکا.

جا بە هەر جۆرێ بێ، هەر کەسێك باوەڕی بەو بەرنامەیە نەبێ کە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی، ئەوە کافرە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لاَ يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ: يَهُودِيٌّ وَلاَ نَصْرَانِيٌّ، ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ إِلاَّ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ﴾ رواهُ مُسْلِم، واتە: سوێند بەو خوایەی گیانی (محمد)ی بە دەستە، هەر کەسێك بانگەوازی منی بگاتێ: جولەکە بێ، یان فەلە بێ، ئینجا بمرێو باوەڕی بەو بەرنامەیەی من نەبێ، ئەوە ئەچێتە دۆزەخ.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُم حَتَّى يَكُونَ هَوَاهُ...): ئەگەر هەواو هەوەس و پێخۆشیی دڵ گشتی نەکرێتە قوربانی ڕێبازەکەی پێغەمبەرﷺ، مرۆڤ نابێتە موسوڵمانی تەواو، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ رواهُ الشَّيْخَان، ئیمانی کەستان تەواو نابێ، تا منی خۆشتر ئەوێ: لە خۆیو دایكو باوکیو منداڵەکانیو گشت خەڵکیتر، واتە: فەرمانی پێغەمبەرﷺ بخاتە پێش فەرمانی ئەوانەو، لە بەر خاتری ئەوانە لە فەرمانی پێغەمبەرﷺ دەرنەچێ.

٢- (حَتَّى يَكُونَ هَوَاهُ تَبَعاً لِمَا جِئْتُ بِهِ): خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللهِ﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ ئەگەر فەرمانت جێبەجێ نەکەن، بزانە: ئەوان شوێن هەواو هەوەسی خۆیان ئەکەون، ئایا کێ گومڕاترە لەو کەسەی شوێن هەواو هەوەسی خۆی کەوتوە بە بێشارەزاییەك لە لای خوا؟.

## ( اَلْحَدِيثُ الثَّاني والأَرْبَعُون: سَعَةُ مَغْفِرَةِ اللهِ تَعالَى )

﴿ عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُـولُ: قَـالَ اللهُ تَعَـالَى: يَـا ابْـنَ آدَمَ إِنَّكَ مَا دَعَوْتَنِي وَرَجَوْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ مِنْـكَ وَلاَ أُبَـالِي، يَـا ابْـنَ آدَمَ لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ وَلاَ أُبَالِي،

---

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ:** ﴿تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ﴾ رواهُ الإمام مالك، دوو شتم لە دوای خۆم بۆ ئێوە هێشتۆتەوە، هەتا دەستیان پێوە بگرن گومڕا نابن: قورئانی پیرۆز، حەدیسەکانی پێغەمبەر ﷺ.

کەوابوو: ڕژێمی (دیمقراطیة)و (إشتراکیة)و (ماسونیة)و (مارکسیة) گشتی گومڕاییو لادانە: لە ڕێبازی خواو پێغەمبەر ﷺ خوا بمانپارێزێ، آمین.

### ﴿ حەدیسی چل و دووەم: لێخۆشبوونی خوا گەلێك زۆرە ﴾

(عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ) گێڕدراوەتەوە لە (ئەنەس) خوا لێی ڕازی بێ، فەرمووی (سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ: يَقُولُ) گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو ئەیفەرموو: (قَالَ اللهُ تَعَالَى) خوای گەورە لە حەدیسێکی (قودسی)دا ئەفەرموێ: (يَا ابْنَ آدَمَ) ئەی نەتەوەی ئادەمی.

**بزانە:** باب (ئادەم) باوکی هەموو ئینسانێکە، دایکە (حەووا)ش دایکی هەموویانە، لە بەر ئەوەیە کە بە ئێمە ئەگوترێ: ئادەمیزاد. خوای گەورە باوکە ئادەمی لە قوڕ دروست کردوە، ئینجا گیانی هێناوەتە بەر، دایکە (حەووا)شی لە پەراسوی باب ئادەمی دروست کردوە.

(إِنَّكَ مَا دَعَوْتَنِي) ئەتۆ هەر کاتێك داوام لێبکەی لە گوناهت خۆش بم (وَرَجَوْتَنِي) تکات لێکردم داوایەکەت وەربگرم، چونکە ئەتزانی من خوایەکی بە ڕەحمو بە دەستەڵاتم (غَفَرْتُ لَكَ) منیش لێت خۆش ئەبمو گوناهەکانت دائەپۆشمو سزات نادەم (عَلَى مَا كَانَ مِنْكَ) هەرچەند گوناهیشت گەورەو زۆر بن (وَلاَ أُبَالِي) من گوێ نادەمە گەورەییو زۆری گوناهەکانت.

پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسێکیتردا ئەفەرموێ: ﴿ئەگەر بەندەی خوا گوناهێکی کردو پەشیمان بۆوەو لە خوا پاڕایەوەو گوتی: (خوایە تاوانم کرد هەر ئەتۆش لە تاوان ئەبووریو لێم ببوورە). ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێ: بەندەی من تاوانی کردو زانی: خوایەکی وای هەیە لە تاوانی خۆش ئەبێو سزای تاوانیشی ئەدا، ئێوە شاهید بن: من وا لێی خۆش بوم﴾. ئەی موسوڵمان هەموو دەم هەر داوا لە خوا بکە لە گوناهت خۆش بێ پشت بە کەسیتر مەبەستە، کەس ناتوانێ گوناهەکانت لە سەر لاببا.

(يَا ابْنَ آدَمَ) ئەی ئادەمیزاد (لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ) ئەگەر گوناهت ئەوەندە زۆر بێ، بگاتە (عَنَانَ السَّمَاءِ) هەوری ئاسمان (ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي) ئینجا تۆبەت کردو تکات لێکردم لێت خۆش بم (غَفَرْتُ لَكَ وَلاَ أُبَالِي) منیش لێت خۆش ئەبم، هەرچەند گوناهیشت زۆر بێ.

يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ لَوْ أَتَيْتَنِي بِقُرَابِ الأَرْضِ خَطَايَا، ثُـمَّ لَقِيتَنِــي لاَ تُشْـرِكُ بِــي شَـيْئًا لأَتَيْتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً ﴾ رواهُ الترمذي وقالَ: حديث صحيح.

---

بەڵام ئەگەر گوناهەکە پەیوەندی بە ئادەمیزادەوە هەبوو: ئەبی خاوەنەکەی ڕازی بکەی بۆ ئەوەی خوا تۆبەت لێوەربگرێ. ئەوەش **بزانە:** تەنها ووتنی (أَسْتَغْفِرُاللّٰه) خوایە لـێم خـۆش بە، بە بێتۆبەکردن گوناهەکە لانابا، بەڵام لە لای خوا بە دوعا ئەنووسرێو هێزی گوناهەکە کەم ئەکاتەوە.

(يَا ابْنَ آدَمَ) ئەی ئادەمیزاد (إِنَّكَ لَوْ أَتَيْتَنِي) ئەگەر تۆ مردیو هاتیە لای من (بِقُـرَابِ الأَرْضِ خَطَايَا) پڕ بە زەمین گوناهت لەگەڵ خۆت هێنا (ثُمَّ لَقِيتَنِـي) دوایـێ کـە گەیشتیە لای مـن، دەرکـەوت (لاَ تُشْـرِكُ بِـي شَـيْئًا) منـت بـە خوایـەکی تـاکو تـەنها ناسـیبو و هاوبەشـت بـۆ دانـەنابوم: لـە خوایـەتیو لـە پەرسـتندا (لأَتَيْتُـكَ بِقُرَابِهَـا مَغْفِـرَةً) منـیش پـڕ بـە زەوی لێخۆشـبوونت بـۆ دێـنمو لـە ئـاگری دۆزەخ ڕزگـارت ئەکـەم (رواهُ الترمـذي، وقـالَ: حـديث صحيح) ئیمامی (تیرمزی) گێڕاویەتیەوە.

**بزانە:** خوای گەورە تەنها لە کافر خۆش نابێ، ئیتر لە تاوانەکانی خەڵکی دی خۆش ئەبێ، ئەگەر حەز بکا.

**هەروەها بزانە:** هەر کەس بە ئیمانـەوە بمرێو بچێتە دۆزەخ، هـەر بـە قـەد گوناهـەکانی ئەسوتێو ئینجا ڕزگاری ئەبێ، بەڵام کافر هەتا هەتایە لە ناو ئاگر دەمێنێتەوە.

ئەی موسوڵمانی خۆشەویست: پێغەمبـەرﷺ ئەفـەرموێ: (سَيِّدُالإِسْـتِغْفَار) گـەورەی دوعـای لێخۆشبوون، ئـەم دوعایەیـە: ﴿اَللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ خَلَقْتَنِي، وَأَنَا عَبْدُكَ وَأَنَا عَلَـى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِـكَ عَلَـيَّ وَأَبُـوءُ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْـتَ﴾ رواهُ البخـاري، سبەینەو ئێـواران بـە دڵو زوبان ئەم دوعایە بخوێنە تاکو خوا لێت خۆش بێو بە بەهەشت شادت بکا.

## ﴿ چەند تێگەیشتنێك لەم حەدیسەدا ﴾

١- (مَا دَعَوْتَنِي، وَرَجَوْتَنِي): پێغەمبـەرﷺ ئەفـەرموێ: ﴿لَيْسَ شَيْءٌ أَكْـرَمَ عَلَـىاللهِ مِـنَ الدُّعَاءِ﴾ رواهُ التّرمذي، هیچ خوا پەرستییەك لە لای خوا بەڕێزتر نیە لە دوعا کردن.

٢- (ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ): پێغەمبەرﷺ ئەفـەرموێ: ﴿وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَذَهَبَ اللهُ بِكُـمْ وَلَجَـاءَ بِقَـوْمٍ يُـذْنِبُونَ فَيَسْـتَغْفِرُونَ اللهَ فَيَغْفِـرُ لَهُـمْ﴾ رواهُ مُسْلِم، سوێندم بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە: ئەگەر ئێوە گوناه نەکەن، خوای گـەورە ئێـوە لائەباو گەلێکیتر ئەهێنێو گوناه ئەکەنو لە خوا گەورە ئەپاڕێنەوە تـا لێیـان خـۆش ببـێ، خوای گەورەش لێیان خۆش ئەبێ.

................................................

٣- (لأَتَيْتُكَ بقُرَابِهَا مَغْفِرَةً): خواى گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾ خواى گەورە لە تاوانى كافربوون خۆش نابێ، لە گوناهەكانى بەرەو خوارتر خۆش ئەبێ، لە كەسێك كە خۆى حەز بكا لێى خۆش ببێ. خودايە لێمان خۆش ببە. آمين...كۆتايى.

منيش بەندەى گوناهبار (**عبدالله عبدالعزيز هەرتەلى**)م، شوكرى خودا ئەكەم كە يارمەتى دام ببم بە خزمەتكارى فەرموودەكانى پێغەمبەرﷺ، لە خوا ئەپارێمەوە كە لە خۆمو دايكو باوكمو دۆستانم خۆش ببێو بە بەهەشت شادمان بكاو خێرى ڕوونكردنەوەى (چل حەديسەكەى پێغەمبەر)مﷺ بۆ بنووسێو شادم بكا بە ديتنى زاتى پاكى خۆى، بمكا بە خزمەتكارى ئايينى پيرۆزى ئيسلام، بمگەيەنێتە كاروانى شەهيدانى ڕێگاى خۆى، گەلى كوردى موسوڵمانيش لە دەست زۆرداران ڕزگار بكاو لە ئوممەتى حەزرەتى (محمد المصطفىﷺ) دەريان نەكا. آمين.

تەواو بوو، پێش نيوەڕۆى ڕۆژىهەينى (٢١)ى مانگى مەولودىپێغەمبەرﷺ، ساڵى(١٤١٣)ى كۆچى، بەرامبەر (٢٧)ى مانگىگەلاوێژ ساڵى(٢٦٩٢)ى كوردى، لە شارى هەولێر-كوردستان.
وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين، وَالْحَمْدُ لله رَبِّ الْعَالَمِينَ.

# ناوەڕۆکی ڕوونکردنەوەی (الأربعين النواوية)


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی ڕوونکەرەوە.......................... | ٣ |
| پێناسەو پێشەکی ئیمامی (النواوي)......... | ٤ |
| چەند زانستێکی حەدیس........................ | ٩ |
| **حەدیسی (١) إنما الأعمال بالنيات**........... | ١٠ |
| نیەتهێنان، کۆچکردن بۆ خوا. | . |
| **حەدیسی (٢) بینما نحن جلوس عند**......... | ١٣ |
| ڕوکنەکانی ئیسلام: شادەهێنان، نوێژکردن، | . |
| زەکاتدان، ڕۆژوو، حەج. | . |
| ڕوکنەکانی ئیمان: باوەڕ بە خوا، بە (ملائكة)، | . |
| بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەران، بە ڕۆژی | . |
| دوایی، بە قەزاوقەدەر. | . |
| چاکە، پێنج پەنهانەکان، نیشانەکانی | . |
| دونیاوێرانبوون، | . |
| **حەدیسی (٣) بني الإسلام على خمس**......... | ٢٠ |
| قەزاکردنەوەی نوێژ،زەکات،ڕۆژوو،حەج. | . |
| **حەدیسی (٤) إن أحدکم يجمع خلقه**.......... | ٢٢ |
| قۆناغەکانی کۆرپەی ناو زگ، دەرمانخواردن | . |
| بۆ لەباربردنی کۆرپە، نوێژی جەنازە لە | . |
| سەرکۆرپەی لەبارچوو. | . |
| **حەدیسی (٥) من أحدث في أمرنا هذا**......... | ٢٦ |
| شوێنکەوتنی جولەکەو دیانەکان، | . |
| (البدعةالحسنة)، (البدعةالقبيحة). | . |
| **حەدیسی (٦) إن الحلال بيّن والحرام بيّن**....... | ٢٨ |
| شوبوهاتی نێوان حەرام وحەڵاڵ، (تقوى)، | . |
| دڵ سەرکردەی هەموو ئەندامەکانە. | . |
| **حەدیسی (٧) الدين النصيحة**.............. | ٣١ |
| پێناسەو چۆنیەتی ئامۆژگاری. | . |
| **حەدیسی (٨) أمرت أن أقاتل الناس**.......... | ٣٢ |
| یاخیبووانی شەریعەتی ئیسلام دەکوژرێن. | . |
| **حەدیسی (٩) ما نهيتكم عنه فاجتنبوه**........ | ٢٤ |
| نەکردنی قەدەغەکراو لەپێشترە لە کردنی | . |
| فەرمانپێکراو، ئەگەر فەرمانپێکراو هەمووی | . |
| نەکرێ نابێ بەشە زۆرەکەی وازیلێبهێندرێ، | . |
| نابێ بۆ ئەنجامدانی ئایین پەرتەوازەیی بکرێ. | . |
| **حەدیسی (١٠) إن الله طيّب لايقبل إلا طيبا**..... | ٣٦ |
| وەدەستهێنانی حەڵاڵ، مەرجەکانی دوعا. | . |
| **حەدیسی (١١) دع مايريبك إلى مالايريبك**...... | ٣٩ |
| **حەدیسی (١٢) من حسن إسلام المرء**.......... | ٤٠ |
| ئاشاکردنی گوناه ئەبێتە هۆی لێنەبوردن. | . |
| **حەدیسی (١٣) لا يؤمن أحدكم حتّى يحب**...... | ٤٢ |
| ئیمان حەفتا و سێ پارچەیە | . |
| **حەدیسی (١٤) لا يحلّ دم امريء مسلم**......... | ٤٣ |
| بە چەند تاوانێك خوێنی موسوڵمان حەڵاڵە، | . |
| تێکدانی کۆمەڵی موسوڵمانان تاوانە | . |
| **حەدیسی (١٥) من كان يؤمن بالله**............ | ٤٥ |
| زۆرگۆتن ناپەسندە، میوان و میوانداری. | . |
| **حەدیسی (١٦) لا تغضب**....................... | ٤٧ |
| دەرمانی توڕەیی، پاداشتی توڕەنەبوون. | . |
| **حەدیسی (١٧) إن الله كتب الإحسان**.......... | ٤٨ |
| چۆنیەتی سەربڕینی ئاژەڵ، سیاسەت. | . |
| **حەدیسی (١٨) إتق الله حيثما كنت**.......... | ٥٠ |
| گوناهەکانی بچوك بە چاکەکردن لادەچن، | . |
| گوناهەکانی گەورە بە تۆبە لادەچن، | . |
| مافی ئادەمیزاد بە گەردەن ئازادکردن لادەچێ. | . |
| **حەدیسی (١٩) يا غلام إني أعلمك كلمات**...... | ٥٢ |
| پاراستنی مافی خوا هۆی فریاکەوتنی خوایە، | . |
| (تقوى) ترسان لە خوا هۆی ڕزق و ڕزگاربوونە | . |
| لە تەنگانە. | . |
| **حەدیسی (٢٠) إذا لم تستحي فاصنع**......... | ٥٦ |
| شەرم بەشێکە لە ئیمان، شەرمکردن لە خوا | . |
| پاراستنی ئەندامەکانە لە تاوانکردن | . |
| **حەدیسی (٢١) قل آمنت بالله ثمّ استقم**....... | ٥٧ |
| بەردەوامبوون لە سەر ئیمان و خواپەرستی | . |
| هۆی موژدەی بەهەشتە. | . |
| **حەدیسی (٢٢) أرأيت إن صلّيت المكتوبات**...... | ٥٩ |
| دونیا فیتنەیە، ئافرەت فیتنەیە، | . |
| دونیا بەندیخانەی ئیمانداره و بەهەشتی کافرە، | |
| چوونە بەهەشت بە ڕەحمی خوایە. | |

# ناوەڕۆکی ڕوونکردنەوەی (الأربعين النواوية)


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| **حەدیسی (٢٣) الطهور شطرالإيمان...** | ٦١ |
| گەورەیی زیکری‌خوا، رەوشتە پاکەکانی پێغەمبەران، کێ کوێری قیامەتە؟ | |
| **حەدیسی (٢٤) یاعبادی إنی حرمت الظلم علی نفسی وجعلته بینکم محرما........** | ٦٣ |
| حەدیسی قودسی، جنۆکە، گەردەن ئازادکردن لە دونیادا، (أستغفرالله) هۆی رزق و رزگاربوونە لە تەنگانەکان | |
| **حەدیسی (٢٥) أن أناساً من أصحاب رسول الله قالوا للنبيﷺ: ذهب أهل الدثور........** | ٦٧ |
| پێناسەو ژمارەی (صحابە)کان، زیکری دوای نوێژەکان، ئادابی (جِماع). | |
| **حەدیسی (٢٦) كلَ سلامى من النّاس........** | ٧٠ |
| چێشتەنوێژ، ئاشتکردنەوەی موسوڵمانان، یارمەتی‌دانی موسوڵمانان. | |
| **حەدیسی (٢٧) البرّ حسن الخلق........** | ٧٢ |
| رەوشتی‌جوان بەرووەستی خەڵك دەکا، دڵی مرۆڤ هەست بە خراپە ئەکا، تاوان و زیانی (فتوی)دەری نەزان. | |
| **حەدیسی (٢٨) وعظنا رسول اللهﷺ........** | ٧٤ |
| رێبازی هەرچوار خەلیفەکان رێبازی پێغەمبەرە، حەفتاوسێ گرۆهی گومرابووی دۆزەخی پەیدادەبن. | |
| **حەدیسی (٢٩) أخبرني بعمل........** | ٧٨ |
| شەونوێژ، (جِهاد) لوتکەی بەرزی ئیسلامە، زوبان هۆی سزای دۆزەخە. | |
| **حەدیسی (٣٠) إنّ الله فرض فرائض........** | ٨٢ |
| پێناسەی واجب‌وحەرام، هیچ کەسێك لە خوا بەغیرەتتر نیە، بیر لەخوا ناکەینەوە | |
| **حەدیسی (٣١) دلني على عمل إذاعملته........** | ٨٤ |
| تەماع لە دونیاو لە ماڵی‌خەڵك مەکە خواو خەڵك خۆشیان دەوێی، سوربوون لە سەر وەدەستهێنانی گەورەیی‌و ماڵ ئایین تێك دەدا، ئەوانەی بۆ خوا یەکتریان خۆش ئەوێ لە ژێر سێبەری خوای‌گەورەدانە. | |
| **حەدیسی (٣٢) لاَ ضرر ولا ضرار........** | ٨٥ |
| زیانلێدان لە ئیسلامدا نیە، پێناسەی (ضَرورَة)و (حاجَة) | |
| **حەدیسی (٣٣) لو يعطى النّاس بدعواهم........** | ٨٧ |
| چۆنیەتی دادکردن، مەرجەکانی‌شاهید، سوێندخواردن، سزای سوێندی بە درۆ. | |
| **حەدیسی (٣٤) من رأى منكم منكراً........** | ٨٩ |
| بێدەنگی لە سەر بێشەرعی دەبێتە هۆی سزادانی خوا، یارمەتی‌دانی کاربەدەستی ستەمکار بێبەشت ئەکا لە ئاوی کەوسەر | |
| **حەدیسی (٣٥) لاَ تحاسدوا ولا تناجشوا........** | ٩٢ |
| حەسودی چیە؟ دۆستایەتی‌و دوژمنایەتی بۆ خوا، مافی‌موسوڵمان لە سەر موسوڵمان، رێزلێنانی‌موسوڵمان بەگوێرەی پلەی‌خۆی | |
| **حەدیسی (٣٦) من نفس عن مؤمن كربة........** | ٩٤ |
| سوککردنی باری‌قەرزدار، داپۆشینی موسوڵمان، قورئانخوێندنی بە کۆمەڵ لە مزگەوتدا، نەژادی‌دونیا سودی نیە لەقیامەت | |
| **حەدیسی (٣٧) إن الله كتب الحسنات........** | ٩٧ |
| چاکە: یەك بە دەیە، خراپە: یەك بە یەکە | |
| **حەدیسی (٣٨) من عادى لي ولياً........** | ٩٩ |
| خوا بەرگری لە دۆستی‌خۆی دەکا، بە کردنی واجب‌و سوننەت دەبیە دۆستی‌خوا | |
| **حەدیسی (٣٩) إنّ الله تجاوز لي عن أمّتي........** | ١٠١ |
| سزای لەبیرچوونەوی قورئان | |
| **حەدیسی (٤٠) كن في الدنيا كأنك غريب........** | ١٠٣ |
| خێری‌نەبڕاوە لەدوای‌مردنیش بۆی دەچێ | |
| **حەدیسی(٤١) لايؤمن أحدكم حتى يكون هواه...** | ١٠٥ |
| هەرکەسێك بە شەرعی خواو پێغەمبەرﷺ رازینەبێ ئیمانی نیە، جولەکەو دیان کافرن | |
| **حەدیسی (٤٢) يا ابنَ آدم إنك ما دعوتني........** | ١٠٧ |
| لێبوردنی‌خوا زۆرە هەرچەند گوناهیش زۆر بن، | |
| دوعای (سَيِّدُالإِسْتِغْفار)........ | ١٠٨ |
| کۆتایی........ | ١٠٩ |